

كتێبی یەکەم

پرۆژەی (٥٠) کتێب بۆ
ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی مسوڵمان

کتێبی یەکەم

# کاک ئەحمەدی موفتی زادە

## دەروازەیەک بۆ خەباتێکی نەناسێنراو


سەروەت عەبدولاّ

## پێشکەشە بە:

* ڕۆحی هەمیشە زیندووی﴿مامۆستا سەعید نوورسی، کاك ئەحمەدی موفتی زادە، مامۆستا ناصری سوبحانی و مامۆستا ئەحمەد زەهاوی﴾.

* هاوسەر و هاوسەفەر و هاوڕێم ﴿بەهرە گوڵئەسەر و کاکە نقار﴾.

* هەموو خەمخۆرانی ڕێگەی حەقیقەت.

# كاك ئەحمەدی موفتی زادە

## دەروازەیەك بۆ ناساندنی كەسایەتی و خەباتێكی نەناسێنراو

چاپی سێیەم

٢٠١٤



## کاك ئەحمەدی موفتی زادە
## خەباتگێڕێکی نەناسێنراو

# ناسنامە

ناوی کتێب: کاك ئەحمەدی موفتی زادە،
دەروازەیەك بۆ ناساندنی کەسایەتی و خەباتێکی نەناسێنراو.
بابەت: مێژوویی.
نووسینی: سەروەت عەبدولاّ.
پێداچونەوە و پێشەکی: مودریك علی عارف.
پیتچن: محمد فاروق.
هەڵەچنی: ئارام محەمەد.
دیزاینی بەرگ: سەروەت گوڵئەسەر.
ساڵ و نۆرەی چاپ: چاپی سێیەم (٢٠١٤).
چاپخانە: سیما - سلیمانی
تیراژ: (١٠٠٠) دانە.
نرخ: ( ..... ) دینار.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی(١١٢٥)ی ساڵی (٢٠١٠) پێ دراوە.



*****

بسم الله الرحمن الرحيم

تەنها بە ناوی خوای گەورە و کاربەجێ

بۆ برەودان و خزمەتکردنی زیاتر بە ڕەوتی ڕۆشنبیری و هەستکردن بەو بۆشاییەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا لە بواری ناساندنی گەورە پیاوان و بیریارانی موسڵمانی کوردەوە هەیە، بیرمان لە پرۆژەیەکی لەو جۆرە کردەوە و بڕیارماندا ئەگەرچی تەنها هەوڵێکیش بوو لەو بوارەدا پرۆژەی (٥٠) کتێب لەسەر گەورە پیاوانی کورد و ئیسلام و خاوەن مەزهەب و هزر و بیریار و سیاسەتمەدار و خاوەن قوربانی و هەڵوێستی بەرز و ناوازە کارێک بکەین، هەر بۆیە پرۆژەکەشمان ناونا «پرۆژەی ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی موسڵمان»، لێرەشەوە ڕایدەگەیەنین هەر بەڕێزێک دەتوانێ نووسینەکەی (بەرهەم)ەکەی بنێرێتە بۆمان، ئەوا بەپێی ڕێکەوتنێک لە نووسەرانی وەردەگرین و پاشی پەسەندکردنی دەخرێتە پرۆژەکەوە.

ئەو گەورە پیاوانەش کە لەبەرچاومان گرتوون لە دەستپێکی کارماندا «کاک ئەحمەدی موفتیزادە - کاک ناصری سوبحانی - مامۆستا سەعیدی نورسی - مەلای گەورە - مامۆستا شێخ محمدی خاڵ - ئەحمەد زەهاوی - مامۆستا محمدی شارەزووری ..... هتد» وە هەروەها ئەوانی دیکە کە لە بوارانەدا بەڕێزیان دیارە و خزمەتیان کردووە .. خوای گەورە گشت لایەک موەفەق بکات ...

پرۆژەی (ناساندنی گەورە پیاوانی کوردی موسڵمان)

خاوەنی پرۆژە

٢٠١٤/٣/٨

٢٠١٤/ ٣/٨

# پێڕست

## چی لەبارەی موفتی زادەوە دەڵێن:

**هەژار موكریانی**"موفتی زادە، بەدڵ ویستی ئازادی بۆ كوردستان بستێنێ. زۆریش ماندوو بووە، كە قەولی ئازادی كوردستانی پێدەدەن. خۆی كەبێ درۆ و دڵ پاكبووە، لای وابوو قەوڵ دەرەكانیش دڵ پاكن..... لام وایە بەمردویش هەزاران كۆمۆنیستی نەزانی دەبێ بەقوربانی بكرێ".

**ناصری سوبحانی**" ئەگەر شورایەك دروستبكرێت بۆ هەموو ئومەی ئیسلامی دەبێت(كاك ئەحمەد)ببێتە سەرۆكی ئەو شورایە، ئەگەر نەشكرێتە سەرۆكی دەبێت ئەندامێكی گەورەی ناو ئەو شورایەبێت".

**راشید ئەلغنوشی"لە ساڵی ١٩٩١** شەرەفمەندبووم بە لەنزیكەوە بینینی مەزنە رێبەری كورد شۆڕشگێڕو زاناو شاعیری خوابەخشیو مەلا ئەحمەدی موفتی زادە، بەوپێیەیی لەلایەن دەستەلاتەوە ستەم و زۆرێكی گەورەی دەرهەقكرابوو.... بە ناحەق تۆمەتبار كرابوو بە پیلانگێڕی دژ بەو شۆڕشەو هەوڵی سەرنخونكردنەوەی، چەندین ساڵ لە تەمەنی لەم پێناوەدا لە زینداندا بە سەر بردبوو.چەند بڕگەیەكی لە شیعرە كاریگەرەكانی بۆ خوێندمەوە، هێندە كاریگەربووم پێی جلەوی خۆم لەدەستداو بە جۆش و گۆشەوە كەوتمە گریان، ئەمما گریا!...".

**یوسف نداء**"ئەحمەدی موفتی زادە،داواکارییەکانی تێکەڵ بوون، ئێمە وەك (ئیخوان موسلمین)، هەردەم داواکاری ئیسلامان لەپێش داواکاری نەتەوەییەوە بووە، بەڵام ئەو داواکاری (نەتەوەی و ئیسلامی)شی، هەبوو".

**عیسا پژمان**" کاتێك ئەحمەدی موفتی زادە زانی(ڕۆژنامەی کوردستان) لەلایەن ساواکەوە بەڕێوە دەچێت ئیتر هیچی بۆ ڕۆژنامەکە نەنووسی".

# پێشەکی

قسەکردن لە سەر کتێبێك کە باسی کەسایەتییەکی دەگمەنو دانسقەو ڕەمزێکی ئایینیو نەتەوەیی گەلی کورد بکات، کەسایەتییەك کە دەتوانرێت بووترێت بەشێکی زۆر ـ یاخود هەموو ژیانی خۆی ـ تەرخان کردبوو بۆ خەبات لە پێناو ڕزگاریو سەربەرزی گەلو نەتەوەو مەزهەبی سوننیو خەمخۆری بۆ هەژارانو نەدارانو نەهێشتنی ستەمی "مەزهەبیو میللیو چینایەتی"و بەرەنگاربوونەوەی هەر سێ ملۆزمو ئافەتەکەی "مفسدینو مترفینو مستکبرین" هەروا شتێکی سادەو ئاسان نییە، پیاوێك کە بڕوام وایە دەتوانرێت بە یەکێك لە باشترین "مُنَظِّر" تیۆریستەکانی تیۆریای "عەدالەت" ناوزەد بکرێت، چونکە هەم لە ڕووی تیۆریو هەم لە ڕووی پراکتیکییەوە هەوڵێکی زۆری لە بواری جێبەجێکردنی عەدالەتتدا داوە، عەدالەتی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو فەرهەنگیو ئایینیو مەزهەبیو لە هەمووان گەورەترو گرنگتر عەدالەتی ئینسانی.

بەوپەڕی قەناعەتو بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەگەر لەبەر حورمەتو خۆشەویستیو خۆبەشاگردزانینی ئەو زاتە مەزنە "کاك ئەحمەد"و خۆشەویستیو ڕێزو مەحەببەتم بۆ نووسەری ئەم کتێبە "کاك سەروەت عبداللە" نەبایە، ئەوا هەرگیز جورئەتم بەخۆم نە ئەدا ئەم چەند دێڕە خاکیو لاوازە بنووسمو لە حزووری کەسایەتیو زاتێکی مەزنو مەحبوبی وەك "کاك ئەحمەدی موفتی زادە"دا ئەم پێنووسە کلۆڵەم بخەمە سەر کاغەز.

ئەو زاتە ڕاستە ساڵەهایەك لە زیندانی ئینفیرادیو لە ژێر قامچی پشت شکێنی "مستكبرين"و بە نییەتی چەپەڵو ناساغی "مفسدين"و بە مشەخۆریو چاپلوسیو خیانەتی "مترفين" بە چەندین شێوەی دڕندانەو نا ئینسانیو نا ئەخلاقیانە جەستەی ئەشکەنجەو ئازار دراو نزیکەی دەساڵ لە ژێر چەپۆكو چنگی ئەشکەنجەی ئینفیرادیدا تووشی چەندین نەخۆشی هاتو دواجاریش هەر بەهۆی ئەو دەردو ئازارو نەخۆشیانەوە گیانی پاکی سپاردو گەڕایەوە بۆ لای خۆشەویسترین کەسو دۆستی کە خوای میهرەبانەو هەروەها هەر بەو شەوقو حەزەشەوە گەڕایەوە بۆ لای "بەنی دڵی گیانی"کە سەروەری ئازیزو خۆشەویستە ـ درودی خوای لێبێت.

بەڵام ئەو ئازیزە ـ لەو حاڵەشدا ـ هێشتا هەر چەند شتێکی دیکە ئازاری دەداو کسپەو قرچەی لە دڵەی زیندووی تاوسەندووی هەڵدەساندو هەمیشە بە نووسینو نامەو یاداشتو قسە گرنگو شیرینو بەهێزو شیعرو هۆنراوە بەچێژو پڕ ماناکانی باسی دەردی دڵو تاوسەندنی ڕۆحی دەکردو "خەمی دووری لە ئاویەرو یارانو ئازیزان"و "حەسرەتی قوڵی بۆ هەتیوانو هەژاران"و "بێ خاوەنی گەلی بەش مەینەت"و "مەزهەبی کەنارخراوو حساب بۆ نەکراو"و "نیشتیمانی پارچە پارچەکراو"و "زێڕی ڕەشو سەروەتی داگیرکراو"ی نیشتیمانەکەی ئاگری بەر دەدایە "دڵە پڕ لە کوڵەکەی"و خەوو خۆراکی لێ بڕیبوو.

هەموو ئەم دەردانەو چەندین دەردی دیکە، ئەم مەردە نەبەردە دلێرە مەزنەیان شەوو ڕۆژ ئازار دەداو چێژو خۆشی ژیانیان لە بیر بردبوویەوە، بەڵام ئەوەی کە سوکنایيو ئارامی دەبەخشییە ئەم ڕۆحە مەزنو باڵایەو دڵە گەورەکەی ئاسودە دەکردو هەموو خۆشییەکانی دونیای بۆ جەمو کۆ دەکردەوە، خۆشەویستیو زیکرو یادی خوای میهرەبان بوو: ﴿**الا بذكر الله تطمئن القلوب**﴾.

ئەو زاتە "خوادۆست"ە، بە زیکرو یادی خوای میهرەبان تۆمەتە ناڕەواکانی دوژمنانو هەڵسەنگاندنو وەصفی هەڵەی جاهیلو نەزانانو ئازارەکانی بەندی ئینفیرادی لەبیر دەچوویەوەو یەك پارچە ژیانی دەبوویە خۆشیو شادیو خۆی لە "سارای بەهەشت"و میوانی لە "خزمەتی پێغەمبەراندا" دەبینییەوە، خۆشیو شادییەك کە مەگەر هەر خۆی بتوانێ وەصفو وێنای ئەو چێژو خۆشییە بکاتو مەگەر هەر خواش بزانێ چەند جار ئەو خۆشیو لەزەتەی چەشتووە، وەك دەڵێ:

**لە جەرگەی جەمی یارانی گیانی**
**تۆم نەبێ هێشتا خۆم پێ تەنیایە**
**تۆم هەبێ تەنیا لە ئینفیرادی**
**لێم جەمە هەرچی خۆشی دونیایە.**

لەوەش زیاتر خەون بینینی کاك ئەحمەد بە "بەنی دڵی گیان"یەوە، کە پێغەمبەری خۆشەویستە - د.خ - جارێکی دیکە ئارامیو ئاسودەیی پێ دەبەخشیو خۆشەویستی ئەو سەروەرە نازدارەی هێندە لە ناخی دڵی بێ قەراریدا دەچەسپاند، دڵی ئەو "موحەممەد دۆستە"ی لە پەڕی گوڵ زیاتر ناسك دەکردەوەو هەر هێندەی کە ناوی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە دەبرا "چاوی هەمیشە تەڕی" پڕ دەبوو لە فرمێسكو هەنسکی بە کوڵی - وەك قازانو مەنجەڵ - دڵی ئامادەبوانی مەجلیسەکەی "صۆفی عەبدوڵلا"ی دەهێنایە کوڵ، خۆ کاتێك کە کاك ئەحمەد بۆخۆی ناوی پێغەمبەر بهاتبایاتە سەر زمانی پڕ لە خۆشەویستیو مەحەببەتی، ئەوا تەزووی بە هەموو گیاندا دەهێناو وەك بوومە لەرزەیەك گیانی دەهێنایە شۆكو لەرزە.

خوێنەری بەڕێز! ئەم هەوڵەی گەنجو لاوێکی چالاكو ڕۆشنبیرو بەسەلیقەی وەك "كاك سەروەت عبدالله"بۆ خستنەڕووی ژیانو خەباتو دڵسۆزی زاناو سەركردەو كەسایەتییەكی وەك "كاك ئەحمەدی موفتی زادە" كە لەم كتێبەدا خستوویەتییەڕوو ـ وەك لە ناونیشانی كتێبەكەدا دیارە ـ باسكردنە لە كەسایەتیو خەباتێكی نەناسراوو نەناسێنراو، بەڕاستی مایەی تەقدیرو نرخاندنو ڕێز لێنانەو شایستەیە كە سوپاس بكرێتو دوعاو نزای خێری بۆ بكرێت، لە كاتێكدا كە بەداخەوە بەشێكی زۆر لە لاوانی ئەمڕۆ سەرقاڵن بە كاری هیچو پوچو بێهودەوە، هەروەها بە قەناعەتەوە دەتوانین بڵێین كە بەڕاستی هەوڵو ماندووبوونو سەفەرو گەڕانو شەونخونی زۆر بە ئامادەكردنی ئەم كتێبەوە دیارەو دەستی بۆ كارو كەلێنێكی مەزن بردووە، كە هیچ نەبێت بۆ گەلێكی ستەمدیدەی مێژوو فەرامۆشكراوی وەك گەلی كورد جێی بایەخەو لەوەش زیاتر ئەم كتێبە باسكردنە لە ژیانو خەباتی مەردێكی خەباتگێری دڵسۆزو بانگخوازێكی كەم وێنەو ئیسلامخوازێكی شارەزاو شاعیرو ئەدیبێكی هەست ناسكی گەلەكەمان.

هەموو ئەم قسانەش ناكاتە ئەوەی كە هیچ كەمو كورتییەك لەم كتێبەدا نەبێت، بەڵام دەتوانین بڵێین تا ئێستا هەوڵێكی لەم شێوەیە ـ لە بارەی كاك ئەحمەدی موفتی زادەوە ـ نەبینراوە.

ئومێدەوارم كە خوای گەورە جوهدو ماندووبوونی "كاك سەروەت" پاداشتەكەی لای خوا سەنگینی ترازوی چاكەكانو بەرزبوونەوەی مەقامی بەهەشتی بێتو، خوێنەرانیش ـ بە سەرجەم ئاستو توێژەكانەوە ـ سود لە ئەزموونو زانیارییەكانی ئەو مەردە خواناسە بانگخوازو خەباتگێڕەی كورد ببەنو چیدی مێژووی ئەم مەردە خەباتگێڕە فەرامۆش نەكرێت.

هەروەها لە خوای مەزن داواکارم کە تەوفیقو یارمەتی برای نووسەر بدات بۆ تەواوکردنو بەچاپگەیاندنی کتێبی دووم لەسەر ژیانی ئەم کەسایەتییە گەورە خەباتگێڕەو چاوی ڕۆشنبیرانو ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ستەمدیدەی پێ شاد بکاتو لەوە زیاتر هەوڵو خەباتو دڵسۆزییەکانی ئەم خەباتگێڕە شاراوە نەبن لەو گەلەی کە ساڵانێکی زۆر بۆیان سوتاو گیانی لە پێناو خۆشیو ئاواتو خەمو مافەکانی ئەواندا کردە قوربانی.

*****

مودریك عەلی عارف

هەڵەبجەی شەهید

هەینی (٢٠١٠/١/١٥)ی زاینی

# مەبەستو پێزانین

سەرەتا پێش ئەوەی دەستخۆشیو پێزانینی خۆم بۆ ژمارەیەك لە ئەزیزانم دەربڕم، بە باشی دەزانم چەند دێڕێك لەسەر ئەم بەرهەمەی بەردەستت بنووسم، نووسین لەسەر ئەو پاڵنەرانەی بوونە هۆكارێك بۆ موتەوەلید بوونی ئەم پەرتوكە.

ئەو ناحەقی و ناشایستانەی بە میللەتی كورد كراوە بە درێژایی مێژوو، تا ئەندازەیەك ڕۆشتووە هەندێك جار خودی دوژمنانی ناحەق ڕێگە بەزەییان بە زەلیلی كوردا هاتۆتەوە! جا ئەم نارەوایی پێكردنە بەشێكی دوژمنانی دەرەكی كورد بوون، بەشێكی دوژمنانو خۆفرۆشانی ناوخۆی كورد بوون، كە دواجار ریشەكەیان هەر دەرەكی بووە. ئەمانە هاتوون بەدەر لە بوارە كۆمەلاّیەتیو سیاسییەكە، بواری فەرهەنگی و مەعریفی ئەم نەتەوە زەمین فراوانەیان بە دوو ڕێگا شێواندووە، لەلایەكەوە هاتوون لەسەر كوردیان نوسیوەو هەموو حەقیقەتەكانیان ئاوەژوو كردۆتەوەو لەشێوەی پەرتوكدا بە خوێنەرانی كوردیان فرۆشتۆتەوە، لەلایەكی دیكەوە هاتوون خاوەن قەڵەمەكانیان بەچە ترسێن كردووەو بەجۆرێكیان پێكردوون نەوێرن حەقیقەتی مێژووی پڕ سەروەری ئەم نەتەوە نفوس وەسیعە بلاّوبكەنەوەو ئازایەتیو چاونەترسی ئەو ڕۆڵە نەبەردانەیان بگێڕنەوە، كە **"چاومرێیان نەكردووە قەدەر گۆڕان دروست بكات"** و بونەتە بزوێنەری ڕەوڕەوەی قەدەرو ئاراستەیانكردووەو گۆڕیویانە، جا بۆئەوەی ئێمەش بەدەردی ئەو پەتا دروستكراوە نەڕۆین، بەپێویستمان زانی خەباتو كەسایەتی ڕۆڵەیەكی ئەم میللەتە مەعروفە بە كتێبخانەی مەعریفەی نەتەوەكەمان شاد بكەین.

نەزانین و نەناسین، دوو دەلیلن تا زەمەن و سنورێکی دیاریکراو قابیلی قبولن، کاتێك دەڕۆیت کتێبێکی وەرگێڕاوی، وەك(ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی)ی (نادر ئینتیسار)، دەخوێنییەتەوە، کە وەرگێڕو نووسەری کورد(عەتا قەرەداخی) وەریگێڕاوە. دەگەیتە ئەوەی دەڵێت: "ئەحمەدی موفتی زادە کە پیاوێکی خۆپارێزی کوردی شیعەی کرماشان بووە"[1]. شۆك لێت دەداتو خەفەت بۆ وەرگێڕێك دەخۆیت، کە لەبارەی یەکێك لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەو سەردەمەوە زانیاری نییە، ئەم مێژووی سەردەمەکەی وەردەگێڕێت، هەڵەی نووسەر دووبارە دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بە پەراوێزێك ڕاستی شوناسی ئەو پیاوە باس بکات. ئەم ڕوداوانە وات لێدەکات، ئەگەر لەسەر(قوری سورەکراوە)، یان هەڵکۆڵین لەسەر(بەرد)یش بووە چەند دێڕێك لەسەر کەسایەتییە ونکراوەکانی نەتەوەکەت بنووسیت.

زەمانێك ڕێت کەوتە شارێکی دابەشکراوی نیشتمانەکەتو لە یەکێك لە زاناکانی ئەو شارە زانستت کۆکردەوە و بۆت دەرکەوت ئەو دەرمانەی لای ئەو هەیە چارەسەری زامە قوڵەکانی جەستەی کۆمەڵگەکەت دەکات، بەڵام لەبەر نەناسراوی، یان بە ئەنقەست بێزراو کراوی، هەوڵی خۆت بدە ئەو بێزراوییانە لابەریت، تەپۆتۆزی غروری لە خشتە براوان بە(با) بەریت، ئەگەر داری باخەکانو گەڵای سەوزی درەختی شارەکەت کردۆتە خامەو مرەکەب، ئەو زانایە بناسێنە و بە خەڵکی بڵێ: (**ژاوەژاوی دوژمنان نەتانخەڵەتێنێ، دەرمانی بەسەرچووی دەرەوە نەتان فەوتێنێ، ئەم پزیشکە ڕۆڵەیەکی خۆتانە، لە پێناو ئێوە زەمەنێکە لە زیندانە**).

---

[1]) نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی، و. عەتا قەرەداخی، ٢٠٠٤، سلێمانی، ل٧٧.

وا دەزانم كە ئێستا زۆر ئاسان دیارە، هۆكارەكانی لە دایكبوونی ئەم پەرتووكە چی بوون؟

ئەم چەند دێڕە پێزانینە لێرە دەنووسم، وەك وەفایەكە بۆ ئازیزانم. دەستخۆشییەكە بۆ ماندوبوونیان، نوقلانەی دەستێكی ماندووە بۆ ئەو چەند ساتەی بەمنیان بەخشی لە تەمەنیان.

بەدڵ دەستخۆشی لە كاك (محەمەد فاروق و كارزان محەمەد نەجم) دەكەم، زۆر ماندوو بوون، كاتێك پیتچنینی ئەم پەرتووكەیان لە ئەستۆ گرت، سوپاسی بێ پایانی ئەزیزانم، خاوەن كۆڵی قورس‌و دڵ پڕ ئومێدانم (جەهانگیر جەلال و سەرهەنگ عەبدولڕەحمان) دەكەم، لەگەڵ كۆڵی خۆیاندا، كۆڵی بەشێك لە وەرگێڕانی بابەتەكانیان لەگەڵ هەڵگرتم. بەدڵ پێزانینم هەیە بۆ (كاك ئارام محەمەد)ی ئەمینم، ئەو بوو بە هیممەتی بەرزی خۆی هەڵەچنی ئەم دەروازەیەی بۆ كردم.

جگە لە سوپاسی بێ قابیل‌و نزای سەرچاوە دڵی، شتێك شك نابەم پێشكەشی مامۆستاو هاوڕێی ئەزیزم (مودریك علی عارف)ی بكەم، عەجیب زەحمەتێكی كێشاوە، بۆ پێشەكی نوسین‌و پێداچوونەوەی ئەم پەرتوكەم.

لە تۆی خوێنەریش، ئەگەر بووینە مایەی زیادكردنی مەعریفەكەت، هیچمان ناوێت، تەنها ئەو كاتانەی دڵت بە ئومێدی خوا ڕۆشنە نزایەكی خێرمان بۆ بكە.

خوێنەری ئەزیز! لە دوا وێستگەدا بە مەبەستەوە دەڵێم بە تۆی بەڕێزو تەواوی لایەنگرانی فیكری (كاك ئەحمەدی موفتی زادە)، لەئێستا و لە ئایندەشدا، ئەم پەرتوكە هەرچی لە ناویدا هەیە، زادەی هەست بە بەرپرسیارییەتی خۆمە بۆ هەموو سەركردەكانی ئەم نیشتمانە پارچە پارچەكراوە، بڕواشم وایە لەسەر هەمووومان پێویستە بە بێ گوێدانە فیكرە و ئایدۆلۆژیا دەست بكەین بە

نووسینەوەی خەباتی هەموو خەباتگێڕە ونەكانی ئەم میللەتە، بۆیە دەڵێم ئەم پەرتووكە پەیوەندی بە هیچ حیزبو دەستەو گروپێكەوە نییەو هەڵگری هیچ ئیعازێكی پێشینەی لایەنێكی مەبەستدار نییە.

دەستخۆشی دەكەین لە هەر خوێنەرێك كە بتوانێت لە ڕێگەی ئیمەیلی یاداشتكراوەوە، ڕەخنەو تێبینیو زانیاری نوێمان بۆ بنێرێت، چونكە بە پشتیوانی خوای گەورە لە زەمەنێكی نزیكدا كتێبی دووەمی (كاك ئەحمەدی موفتی زادە) بە ئێوەی خوێنەر دەناسێنین، كە دەروازەیەكە بۆ ناساندنی دونیای فەلسەفی و سیاسی و كۆمەلآیەتی و مەعریفی كاك ئەحمەد.

❊❊❊❊❊❊❊

سەروەت عبدولاّ

هەڵەبجەی شەهید

٢٠١٠/١/٢٤

## بۆ چاپی دووەم...

زۆرجار مرۆڤ دەیەوێت کارێك بکات بۆئەوەی خزمەتێك بە مرۆڤەکان بکات، بەڵام بەبێئەوەی ئاگایی لە خۆی بێت ئەو کارەی کردویەتییە هۆکار بۆ خزمەتکردن سەیردەکەیت کارەکەی خزمەتێکی زۆرتری بەئەم کردووە! ئەمەش کاتێك دەردەکەوێت ئەگەر کارکەران بیانەوێت دەرکی پێبکەن، بەندەش لەم کتێبەدا ویستم خزمەت بە زاتێك بکەمکە کە زۆر لەوەی ئێمە پەیانپێبردووە خزمەتی کردووە، کەچی ئەوەندەم نەزانی خۆم لەبەردەم دونیایەك لە گۆڕانکاریدا بینییەوە، گۆڕانکاری مەعریفی و عەمەلی، بۆیە لەم چەند دێڕەدا دەمەوێت بە هەموو ئەوانەی توانای خزمەتکردنیان هەیە ڕابگەیەنم (**خامەکانتان وەدەستەوە بگرن و هەموو ئەو سەربازە نادیارانەی دونیایی کوردی بناسێننو تا ئەو ئەندازەی بۆتان دەکرێت تەپوتۆزی مێژوو لە ڕوخساری کار و تێکۆشانەکانیان لابەرن و دەستبکەنە خزمەتکردنیان، چونکە دواجار ئەو خزمەتەی بەوانی دەکەن دەبێتە خزمەتکردن بەخۆتان**)...

کاتێك بڕیارمدا کارێکی بەم جۆرە لەسەر (کاك ئەحمەد) ئەنجام بدەم، پێشبینی ئەوەم دەکرد کارێکی سەرکەوتووبێت و جێگەی دەستخۆشیو نرخاندنی خوێنەران و خۆشەویستانی (کاك ئەحمەد) بێت، بەڵام بەم جۆرەنا کە دوای بڵاو بوونەوەی بینیمو پێمگەشتەوە! وەك دیارە هەمیشە لەم جۆرە سەرکەوتنانەدا دوو هۆکار کاریگەر بە بەردەوام ئامادەگیان هەیە، یەکیان تەوفیق و هاوکاری لەبن نەهاتووی خوای گەورە، دووەمیان گەورەی و بلیمەتی و خۆشەویستی ئەو کەسەی دەبێتە ئامانجی کارەکەت، واتە ئەوە گەورەی (کاك ئەحمەد) و پەیامەکەیەتی کەبەو جۆرە پێشوازی لەم بەرهەمەی بەندە کراو لەچەندین ناوچەی دوورونزیك و لەلایەن چەندین کەسایەتی دیارو ناسراوەوە دەستخۆشیان بۆ ناردمەوە، کە هەموو وتەو نامەکانیان مایەی ڕێز لێگرتنە... لەڕاستیدا هەر ئەم هۆکارەیە وایکرد هەوڵی لە چاپدانەوەی (کتێبی یەکەم) بدەینەوە، چونکە لەلایەن زۆرێك لە دۆستان و خۆشەویستانەوە پێشنیارکرا کە ڕەزامەندی لەسەر

لەچاپدانەوەی دەربڕین، ئەویش لەبەرئەوەی داواکرییەکی زۆری لەسەرە، کە دەتوانم بڵێم تەنها لە (دوو مانگ)ی دوای بڵاوبوونەوەی (چاپی یەکەم)دا داواکرا (چاپی دەووەم) بکرێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی خۆم سەرقاڵی نووسینی (**کتێبی دووەم**) بووم، لە هەمان کاتدا دەبوایە کتێبێکی (شەهید ناصری سوبحانی)م بەناونیشانی(**لادانەکانی بەشەرییەت و ژیانی مونمینانە**)وە ئامادەبکردایە، لەلایەکی تریشەوە چاودێری ئەوکتێبەمم بکردایە کە ئێستا بە ناونیشانی (**تاوانە ئینتەرنێتییەکان لە نێوان ئەخلاق و یاسادا**)لە بازاڕدایە، ئەمە جگە لە سەرقاڵیم بە زانکۆو کاری ڕۆژنامەنووسییەوە نەدەکرا ئەو ڕەزامەندییە دەربڕم، بەدەر لە هەموو ئەمانەش، وەك لە (چاپی یەکەم)دا دەردەکەوێت هەندێك هەڵەی چاپ و دیزاین هەیە، کە زۆر گرنگ بوو پێداچوونەویان بۆ بکرێت، هەروەها لە ئەنجامی خوێندنەوە و گەڕانی بەردەوامم دەربارەی (کاك ئەحمەد) و دەورانی کاری ئەو، دەستم بەچەند زانیارییەکی گرنگ کەوت کە دەبووایە بە ئەمانەتەوە ئەو زانیارییانەشم زیادبکردایەتە سەر ئەم چاپە تازەیە، بۆیە سوپاس بۆخوا لەم چاپە تازەیەدا هەندێك زانیاری گرنگم بڵاوکردۆتەوە کە شایستەی ئەوەی هەیە بە گرنگەوە لێیان بڕوانرێت، وەك دڵخۆشکەرییەك بۆ خوێنەران و ئەوانەی چاوەڕوانی (**کتێبی دووەم**)ن، سوپاس بۆ خوا کارێکی باش و جدیشم لەودا ئەنجام داوەو انشاالله لەکاتێکی زۆر نزیکدا بە چاپی دەگەیەنین، کە لەوێدا هەوڵدراوە بە پشتبەستن بە فیکرو پەیامەکانی خودی (کاك ئەحمەد) کار لەسەر ئەوەبکرێت، کە مشتێك لە خەرمانی پڕ بەرەکەت و فراوانی کێڵگەی مەعریفەی ئەم زانایە وەربگیرێت و بەشێوەیەکی شایستە بگوازرێتەوە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە، بۆنمونە یەکێك لەو باسانەی کە لە (**کتێبی دووەم**)دا کاری لەسەر کراوە بریتییەلە (**بوونیادنانی خێزانێکی ئیسلامی لە کۆمەڵگەدا**)، کە تێیدا هەموو قۆناغەکانی دروست بوونی ئەو خێزانەی باسکراوە، هەر لەوکاتەی خوازبێنی کچێك دەکرێت بۆ کوڕێك تا دەگاتە منداڵبوون و پەروەردەکردن و چۆنییەتی مامەڵە کردن لەگەڵمنداڵدا، بۆئەوەی تووشی نەخۆشی دوو

كەسایەتی (ئیزدواجیەتی شەخصییەت) نەبێت، جگەلەوەش لە بەشێكی تری كتێبەكەدا چوینەتە خزمەت دونیای فكری و فەلسەفی (كاك ئەحمەد)، تێیدا چەند دەروازەیەكمان كردۆتەوەو لێیەوە (كاك ئەحمەد)مان ناساندووە بە خوێنەران و بڕیارانی كورد، كە گومانمان نییە لەوەی دەبێتە كلیلێك بۆ چارەسەركردنی چەندین كێشەی فیكری ڕیشەدار....!

# ڕەچەڵەكو لەدایكبوونی كاك ئەحمەدی موفتی زادە

مامۆستا ئەحمەدی موفتی زادە، یاخود بەناوە مەشهورەكەی خۆی كاك ئەحمەدی موفتی زادە لەمانگی(بەهمەن)ی ساڵی(١٣١١)[١]ی كۆچی هەتاوی، بەرامبەر(١٩٣٤)ی زاینی، لەشاری(سنە)ی پایتەختی كوردستانی ڕۆژهەڵاتو ناوەندی ڕۆشنبیری و زانست، لە بنەماڵەیەكی ئایینی و خاوەن زانستی ناودار، بە ناوی بنەماڵەی(مفتی)لە دایك بووە[٢].

باوكی ناوی(مەلا محمودی موفتی كوڕی عەلامە مەلا عەبدوڵای كوڕی مەلا محمودی دشە)یە. باوكی كاك ئەحمەد(مەلا محمود) -خوای گەورە لە هەردووكیان خۆش بێت- یەكێك لە كەسایەتیە ناودار و ناسراوەكانی(سنە)و ماوەیەكی زۆر حاكم شەرعیو موفتی ئەوێ بووە، مەلا محمود لە پاڵ ئیمانداری و ئازایەتییەكەیدا كەسێكی خاوەن بڕیار و قانع بووە، دەگێڕنەوە كاتێك لە لوتكەی نەداریو هەژاریدا ژیاوە، (والی سنە)دیاری تایبەتی بۆ دەنێرێت، بەڵام لەبەرئەوەی گومانی كردووە، پێدەچێت والی لە بەرامبەر ئەم دیارییەوە چاوەڕێی ئەوە بكات كە باوكی كاك ئەحمەد بڕیارێكی نا مەشروع لە بەرژەوەندی ئەو دەربكات دیارییەكە وەرناگرێت و دەیگەڕێنێتەوە[٣].

مامۆستا مەلا عەبدوڵا، واتە باپیرەی كاك ئەحمەد خەڵكی گوندی(دشە)یە كە دەكەوێتە نزیكی(پاوە) لەوێوە كۆچیكردووەو هاتۆتە شاری سنەو نیشتەجێ بووە،

---

[١]) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.١، بەخشی یەك، ل ١٩

[٢]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، ا-زز-.

[٣]) كاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێكەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.١، بەخشی یەك، ل١٩

ئەم پیاوە بەڕێزە ساڵەكانی فەقێیەتی لەناوچەكانی كوردستانی ئێران و عێراقدا بەسەربردووە، پاشان دەبێتە یەكێك لە زانا ناودارو گەورەكانی سەردەمی خۆی، هێندە زانایەكی شیاو دەبێت بەناوی(عەلامەی دشەیی)[*] ناوبانگ پەیدادەكات‌و-دیارە دواتریش كاك ئەحمەدیش هەمان ناوبانگی دەبێت لە ڕووی عەلامەییەوە-دەبێتە وانەبێژ لەمزگەوتی(جامعەی دارالاحسانی سنە)و موفتی كوردستان.[١]

باپیرەی(كاك ئەحمەد) شەش كوڕی هەبووە، هەموویان زانا و كەسایەتی دیارو بەناوبانگی سەردەم‌و وڵاتی خۆیان بوون. مەلا محمودی باوكی كاك ئەحمەد كوڕە گەورەی بووە، كە لە هەموو زانیارییە ئایینییەكاندا دەستێكی باڵاو شارەزاییەكی زۆری هەبووە بەتایبەتی لە(فقە و ئوصل فقە و فلسفە)دا، هێشتا عەلامە عەبدوڵای باوكی لە ژیاندا بووە بووەتە موفتی و حاكم شەرعی كوردستان، و هەروەها یەكێك بووە لە مامۆستاكانی( فقهی شافیعی )لە زانكۆی(تاران).[٢]

پێنج كوڕەكەی دیكەی( عەلامەی دشە)ی و مامەكانی(كاك ئەحمەد) بریتی بوون لەم كەسایەتییانە:

یەكەم: مامۆستا مەلا محەمەد ڕەشید، كە زانایەكی گەورەبووەو لە شاری (بەیروت)ی پایتەختی(لوبنان)، چەند ساڵێك لەمەوبەر كۆچی دوایی كردوە.[٣]

---

[*]) عەلامە: زانایۆخ، فریەزان، زۆرزان، ئەوەی زانیاری زۆر و زەبەندی لەهەموو بوارێكداهەیە. دانشگای كردستان: فرهنگ فارسی-كردی، ج٣(ع-ی)،چاپ اول،١٣٨٧،ل١٦٧٩.

[١]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، ل- ح ح -

[٢]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەكەم ، زستانی ١٣٨٦، ل- ح ح -

[٣]) چاوپێكەوتنێكی بڵاونەكراود نوسەر لەگەڵ ( كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان – سنە -٢٠٠٨.

دووەم: مامۆستا مەلا خالیدی موفتی، تا ساڵی(١٣٥٥ك-هـ) موفتی و حاکم شەرعی ڕەسمی کوردستان بووە.

سێیەم: مامۆستا مەلا محەمەدی موهری. ناوبانگە بە(بورهان ئیسلام)کە مامۆستاو وانەبێژی(حقوق و ئەدەبیات)ی عەرەبی بووە لە زانکۆی(ئەستەمبوڵ)ی تورکیا.

چوارەم: دکتۆر محەمەد سدیقی موفتی زادە. دکتۆرای هەیە لە(ئیلاهییاتا)و مامۆستای زمانی کوردییە لە زانکۆی(تاران)، ماوەیەکیش لە بەشی کوردی ڕادیۆی تاراندا دەرس دەڵێتەوە.

پێنجەم: دکتۆر عەبدەلڕەحمانی موفتی زادەیە، کە مرۆڤێکی لێهاتوو دڵ پاك و پیاو چاکە.

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دوو براو خوشکێکی هەبوو، براکانی هەرچەندە چالاکی دینییان نەبوو، بەڵام مرۆڤێکی تێگەیشوو بەئیمان بوون، خوا لێخۆش بوو(کاك عەبدولا و کاك هادی)، هەردووکیان دوای(کاك ئەحمەد) وەفاتیان کرد. خوشکەکەشیان خوا لێخۆش بوو(سعیدە خانی موفتی زادە)یە، و هاوسەری خوالێخۆش بوو(بابا مردوخ ڕوحان)ی بوو، (بابا مەردوخ) یەکێکە لەکەسە لێهاتووەکانی بواری شیعرو ئەدەب و بەهەرسێ زمانی(کوردی-فارسی-عەرەبی) نوسیوویەتی.[1]

پیاوە گەورە و ناودارو بلیمەتەکانی مێژوو ئەوانەی بۆ ساتێکیش مێژوو و نەوەکانی مرۆڤایەتی ناتوانن غافڵبن لێیان و لە ڕوداوەکانی ژیاندا دەگەڕێنەوە لایان و گوێ بۆ پەندو ئامۆژگارییەکانیان دەگرن، هەر لەسەرەتای منداڵیانەوە نیشانەگەلو

[1]) کاك حەسەنی ئەمینی: یاد ایام....(چاوپێکەوتن)،گۆڤاری راه ما،ژ.١، بەخشی یەك، ل١٩

هەڵسوكەوتێكیان لێدەر دەكەوێت، كە دەبێتە مایەی سەرەنج ڕاكێشانی كەسانی دەوروبەریان، بەجۆرێك لەناو هاوتەمەن و هاوپۆلەكانیاندا زیاتر جێی گرنگی پێدانن.

كاك ئەحمەدیش، بێگومان لەو پۆلە لەپیاوانی خاوەن كەسایەتی تایبەت و شەهامەت بووە، ئەم تایبەتییەش هەر لە سەرەتای منداڵیدا لە لایەن خۆی و كەسانی دوور و نزیك لە خێزانەكەیەوە دەركی پێ كراوە، خۆی دەڵێت"لەبیرم دێ نزیكەی(٤-٥) ساڵان بووم، زۆر منداڵ بووم، كەسانی گەورە دەیانگرتمە باوەش و شۆخیان لەگەڵ دەكردم، ئەوشۆخیانەی لەگەڵ منداڵ دەكرێت، جۆرە جنێوێكی دەدرێتێ بە عیبارەتی گاڵتە پێ كردنی كە لەئامێزی خۆشەویستییەوە دێتەدەرەوە، پورێكم بوو خوشكی دایكم بوو، زۆر پیرو قەدیمی بوو لەو سەردەما مرۆڤێكی زۆر موسوڵمان و بەئیمان بوو، جارێكیان لەبیرمە، لەبەرئەوەی زۆر گرنگ بوو لە بیرم ناچێتەوە، چونكە ئەو شتانەی زۆر گرنگ نەبن لە زهنی مرۆڤدا نامێنێتەوە، ئەو پورەم بە توزێك جدی و شۆخییەوە ئاگاداری ئەو كەسانەی كرد كە گاڵتەیان لەگەڵ دەكردم، كەوا لەگەڵ(ئەحمەد) شۆخی مەكەن، من لە خەودا دیوومە(ئەحمەد) جۆرێكی تر دەبێت، نابێت وا لەگەڵی گاڵتە بكەن"[1].

هەر لەتەمەنی منداڵیدا دەبێت، ڕۆژێك ماڵەوەیان داوای لێدەكەن بڕوات لە بازاڕ پێداویستیان بۆ بكڕێت، كاتێك دەچێتە دەرەوە دەبینێت(سەگ)ێك لە برساندا كەوتووە، لەو كاتەدا دەگەڕێتەوە ماڵەوەو نانی بۆدەبات و تێری دەكات، پاشان دەڕوات بۆ كڕینی شتەكان، لەو ساڵانەی سەرەتای تەمەنیدایە كە ڕۆژانە دەچێت بۆ

---

[1]) شریتی (ئەمانەت).

یارمەتی ئەو ژن و پیاوە پیرەی لە خانوویەكی بەرامبەر ماڵی خۆیاندا دەبن لە(سنە)و یارمەتی و ئیش و كاریان بۆ دەكات بێئەوەی كەس پێی بزانێت.

یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی سەردەمی منداڵی(كاك ئەحمەد) ئەوەیە، كە جگە لەوەی خۆی خەوی تایبەتی بینیووە، كەسە دور و نزیكەكانیشی بەهەمان جۆر خەویان پێوە بینیوەو هەمیشە لە خەوەكانیاندا(كاك ئەحمەد) مەقام و پلەی تایبەتی هەبووە، خۆی لە شریتی(ئەمانەت)*دا دەگێڕێتەوە، كە خۆی بەڕووداوێكی سەرسوڕهێنەرو داچڵەكێن باسی دەكات،"جارێكیان ڕووداوێكی سەیر ڕوویدا! تەقریبەن تەمەنم لە نێوان(٨-٩) ساڵیدا بوو، وا تەصەوردەكەم زستان بوو لە ژێر كورسیدا ڕاكشابووم، ژنێك هەبوو دۆستایەتی لەگەڵ دایكمدا زۆر بوو، بەیانی زوو بوو هات بۆلای دایكم لەو كاتەدا منیش خەبەرم بوو بوویەوە، بەلاّم لەناوجێگاكەدا هەڵنەسابووم، ڕوویكردە دایكم و پێی ووت"خەوێكی سەیرم دیووە بۆت دەگێڕمەوە"-بەخوا ڕەنگە(٩)ساڵیش نەبووبم، كە سەیری حاڵ و وەزعی ئەو كاتەم دەكەم دەبێت كەمتر بووبێت لە نۆ ساڵ، باش ساڵی تەمەنم لە بیر نییە-، ووتی "ئەمشەو لە خەوما لەشكرێكی زۆر لە سوچی مزگەوتی(هەژار)ەوە -مزگەوتی هەژار مزگەوتێك بوو لە(سنە) پێموایە ئێستاش هەرماوە بەو ناوەوە، كە تەقریبەن دەكەوێتە باكوری(سنە)وە، لەو شەقامەی كە پێیاندەوت شەقامی(فەراح)و ئێستا بەشەقامی(شهداء) بەناویانگە، دەكەوێتە كۆتایی ئەو شەقامە لە لای ڕۆژئاوایەوە-وتی"وامزانی لەشكرێكی زۆر گەورە لە وێوە بەرەوخوار دەهات، پرسیارم كرد ئەمە چییە؟ ووتیان ئەمە سوپای(ئەحمەد)ە،

---

*) شریتی ئەمانەت :- بریتیە لە كۆمەڵێك سەرگوزشتەی كاك ئەحمەد، كە خودی خۆی لە كاتێكی تایبەتیدا بۆ چەند برادەرێكی نزیكی خۆی باس دەكات. كە كۆمەڵێك شتی باسكردووە لەوەو پێش بۆ هیچ كەسی نەدركاندووە، دوای تەواو بوونی گفتوگۆكەش فەرموویەتی" ئەم شریتە بلاّونەكەنەوە تا دوای مردنی خۆم، لەدوای ئەوەی كە مردم ئینجا با خەڵكی گوێی لێبگرن".

ووتی"منیش لەخەوەكا پێم سەیر بوو، سوپایەكی ئاوا گەورە هەمووی پیاوی گەورە گەورەو(ئەحمەد) منداڵێكە!! لە خەوەكا ووتم"یانی چی(ئەحە ڕەش)* سوپای دروست كردووە؟ سوپای بۆ چییە؟ پێیان وتم"تۆ نازانی سوپایەك پێكەوەدەنێت و كارێك دەكات(حەزرەتی عەلی) كاری وای نەكردووە بۆ ئیسلام! زۆر سەیر داچڵەكیم لەناو جێگاكا".

كەسایەتی كاك ئەحمەد، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە ڕوون و ئاشكرا دیاربووە مرۆڤێكی كە سادەو ساكارنییە، بەڵكو كەسێكی بەلیاقەو تایبەتە، ئەو هەر لەو تەمەنی منداڵیەیدا چەند جار لەخەویدا بەخزمەتی خودی پێغەمبەر(ﷺ) دەگات و لەگەڵیدا دادەنیشێت و وانەی فێردەكات، كەدواجار هەر ئەو خەوەیە دەبێتە دەروازەو دەلاقەیەكی نوری میهرەبانی پەروەردگارو بەتەواوی بەڕوویدا والاّ دەبێت، لە بەشەكانی دواتردا ئەو ڕووداوانە باسدەكەین.

"لە دەورانی منداڵیمدا ڕووداوی زۆر ڕویدەدا، بۆخۆشم جارجار خەوی عەجیبم دەبینی، لەخەودا زۆر بەخزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگەیشتم، لە زۆربەی خەوەكانیشدا یا نوكتەیەك(خاڵێك)ی ڕۆشنی تێدابوو، یان نوكتەیەكی نا ڕوون بوو بەشێوەی ڕەمزو خوازە، بەلاّم بەشێوەیەكی گشتی خەوەكانی(فێركاری) بوون، لەناو ئەو خەوانا دانەیەكیان تەقریبەن باش لەبیرمە، هەڵبەتە بەشێكی خەوەكە زۆر ڕۆشنە، بەلاّم بەشێكی تاریكەو ڕوون نییە! ڕەنگە تەمەنم ئاوا دەوری(٦-٧) ساڵێك دەبوو. لە خەوەكەمدا پێموا بوو لە سەربانێك لەگۆشەیەك نزیك(باكوری خۆرئاوا)ی بانێك(سەربان)، واتە بانێكی گەورە بوو بەدەوریداو ناوەڕاستەكەی حەوشەیەكی قوڵی گەورە بوو. حەوشەكە لە چاو بانەكەدا زۆر قوڵ بوو لەو گۆشەیەدا(پلوسك)ی كێشابوو

---

*) ئەحە ڕەش: نازناوێكی خۆشەویستانەیە كە بە منداڵی پێیان وتووە , خۆی دەفەرموێت "كۆمەڵێك ووشەی نەوازش هەیە لە زمانی كوردیدا كە ناودەگۆڕێت , جار جار بە نەوازشەوە بانگیان دەكردم ( ئەحە ڕەش )." ئەمانەت.

بۆناو حەوشەکە، بان و شتەکە ووشك بوو، بەلاّم (پلوسك)ەکە بەفری تێدا بوو، بەفرێکی جوان. خۆم دابوو بەسەر پاساری بانەکەداو دەستم خستبوو بەرەوخوار لە(پلوسك)ەکە بەفرم دەردەهێناو دەمخوارد، لە کاتێکدا وەرز و کاتەکە هێنی ئەوە نەبوو بەفر ببارێت!! هەوا خۆشبوو یان ووشك بوو، کەچی ئەو بەفرە هەبوو، نەمزانی چۆن بوو، لە ناکاو زانیم وام لە خوارەوەی حەوشەکەدا. ماوەی دووریەکە ئەوەندە زۆر بوو لە سەرەتادا ناوحەوشەکە دیار نەبوو تا بزانم چییە، گەیشتمە ناو حەوشەکە، لەو گومەزییانەی لەسەر گۆڕ دروست دەکرێت لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو، هەروەها سەکۆیەکی بەدەوردا بوو، لەسەکۆی لای ڕۆژئاوایەوە گوڵ و باخچەو شتێك هەبوو، کە یەك نەفەر خەریك بوو ئاوی گوڵو باخچەکەی دەدا، منیش بەبێ ئیرادەی خۆم نەمزانی چۆن بوو! کەوتمە لای شانی ئەو کەسەوە، وەها کە بەدەستی ڕاستی خەریك بوو ئاو پرژێنی گوڵەکانی دەکرد، دەستی چەپی کەوتە سەر شانم.

لەخەوەکەمدا زۆر منداڵ تر بووم لە وەی کە لە ڕاستیدا بووم، ڕەنگە(٢-٣) ساڵ منداڵ تر بووم، دەستی خستەسەر شانی ڕاستم و خەریك بوو ئاو پرژێنی گوڵەکانی دەکرد، وورده وورده نەوازشی منی کردوو قسەی لەگەڵ کردم. فەرمووی"زۆڵە نامناسی؟".

ووتم: نەخێر.

فەرموی: من(محەمەد بن عەبدولاّ)م. پێغەمبەرم.

ووتم: بەڵێ.

ئاو پرژێنی گوڵەکانی نەکردو،و فەرمووی(ﷺ)"ڕۆڵە با برێك شتت پێ نیشان بدەم. دەستی گرتم و بردمی بەرەو گۆشەی باکوری خۆرهەلاّتی حەسارەکەوە، کە تاقێك بوو، پاشان ناو دالاّنێك بوو دەچووە ژوورەوە. چووە ژوورەوە یەکەمجار ژوورێك بوو، ژوورەکە چاڵێك لەناوەڕاستیدا بوو، کە نزیکەی دوو مەتر درێژ بوو، ژوورەکە هەمووی ڕەنگی(بۆر) بوو بۆرێکی ساف، لەناو چاڵەکەدا شتێك کە شێوەی کەروێشکێکی

پلاستیك، ئەمما گەورەو زۆر گەورە بەقەد مەڕێکی گەورە، ئەویش ساف و بۆر بوو، دەنکە دەنکە گەنم پڕابوو.

فەرمووی: ئەزانی ئەمە چییە؟ عەرزم کرد: نەخێر.

فەرموی: ئەمە(واتە کەرویشکە پلاستیکییەکە) ساڵێك خزمەتکاری ئەم مزگەوت و قەبرە بوو، بەلاّم زۆر فەقیرو موحتاج بوو لەوانە بوو لە برساندا بمرێت، موسوڵمانان هیچ دڵیان بۆی نەدەسوتا و هیچ کۆمەکییان نەدەکرد، ئەمەمان نارد بۆی تا لەبرساندا نەمرێت.

عەرزم کرد: بەڵێ.

لەلای ڕۆژئاوا گەڕایەوەو منیشی لەگەڵ خۆیدا برد، سەیرم کرد لەلای ڕۆژئاواوە نزیك لە دیوارەکە، کە پەیوەندی هەبوو بەو حەوشەوە، بە شێوەیەکی بەردەوامی و دورو درێژ لە دوای یەك دەرگا دیارەو ژوور ژوورە. بردمی بۆ ژووری(سێیەم) بە دیوارەکانیدا هەمووی وەرەقەی گەورە گەورە، کە وێنەیان لەسەر بوو داکوترا بوون، وێنەیەکی تێدابوو کە لەو ڕۆژانەدا وێنەی وا نەبوو، بەلاّم دواتر کە(شاهەنشاهی) دەسەلاّتی زۆر بوو ئەو جۆرە وێنانە زۆر بوون، هەمووی ژنی قول ڕووت، قول ڕووتوو درێژ درێژی سەیربوون!! ئەو وێنانە هەمووی، سەرو مل ڕووت بوو دنکە دنکە پیاویشیان تێدا بوو، وەك وێنەی ئەو پیاوانەی بۆ ڕیکلامی جل و بەرگ دادەکوترێن.

فەرمووی(ﷺ) "ڕۆڵە ئەمە فیتنەی ئاخر زەمانە خۆتانی لێ بپارێزن، هەر ئەوەنەی کە بەتێگەیشتنی منداڵانەی خۆم وشەیەکم بەناوی فیتنەی ئاخر زەمان لە مێشکدا بوو لێی ترسام، ئەویش وەك ئەو تێگەیشتنە منداڵانەی من ئەوەی فەرموو.

عەرزم کرد: بەڵێ.

لەوکاتەدا لە تەواوی ئەو خەوەدا تەنها ئەم خاڵە ڕۆشن بوو بۆم و لێی تێگەیشتم، باقی خەوەکە تەوەڵ تا ئاخری تا ئێستا لێی تێنەگەیشتووم!![1]

لێرەوەیە کاتێك لە ژیانی ئەم پیاوە گەورە ڕادەمێنیت و بیر لەو ڕووداوانە دەکەیتەوە کەلەسەرەتای تەمەنی منداڵیدا ڕوویداوە هەست بەوە دەکەیت، جگە لەو زانیاریانەی ئێمە لەسەر ئەم زانایە دەیزانین چەندین زانیاری پڕ بایەخ و گرنگی دیکە لە ژیانی تایبەتیدا ڕوویداوە، بەڵام لەبەر هەر هۆکارێك بێت باسنەکراوەو نەگێڕاوەتەوە، جگە لەوەی خودی(کاك ئەحمەد) لەکاسێتی(ئەمانەت)دا زۆر بە ڕاشکاوی ئاماژە بەوە دەکات زۆر ڕووداوی سەیر لە ژیانیدا ڕوویداوە، بەڵام تا ئێستا بۆ کەسی باس نەکردووە. خۆی دەڵێت"زۆرم لا گرانە ئەو ئامانەتە بخەمە دەرەوە بە چەند دەلیلێك کە گرنگترین دەلیلیان ئەوەیە، ئەو ئەماناتە ڕەحمەتێکی گەورەی ئیلاهی بوو. بەڕاستی دەبوو بەکردەوە و ئەخلاقی ئیسلامییەوە قەدرم بگرتایە، قەدرم نەگرت و زۆر گرانە دەری بېرم و لای باقی موسوڵمانان باسی بکەم، بەڵام برێك لەبابەتی تایبەت بەڕاستییەکانی ژیانم جارجار بۆ کەسانێکم باس کردووە، بەتایبەتی کاتێك لە(سنە)بووم کات و شوێن گرنگی ئەوەی دەردەخست و دەمزانی کەسانێك هەن لە دەوروبەرن مناڵ و مەعسومن. جار جار برێك لەو ڕاستیانەم بۆ دەگێڕانەوە، بەڵام بە جۆرێکی ڕێك و ڕۆشن و ئاشکرا تا ئێستا بۆ کەسم نەوتووە، تا ئێستاش خۆم بە لایەقی ئەوە نازانم ئەو حەقیقەتە ئاشکرا بکەم هەروا کە ئاماژەم کرد، لایەقی ئەوەشم نەبووە ئەو ڕەحمەتە گەورە ئیلاهییە سامەیلم بێت.[2]

وەك لە ووتەکانی کاك ئەحمەد، خۆیدا دەردەکەوێت زۆر لایەنی شاراوە لە هەموو قۆناغەکانی تەمەنیدا هەیەو کەس پەی پێ نەبردووە، قۆناغی منداڵیشی لەو نادیارییە بێبەش نەبووە، بۆیە دەکرێت زۆر ڕووداوی گرنگ و پڕبایەخی دیکە هەبن و بەداخەوە ئێمە پێی نەگەشتین و لێرەدا باسمان لێوە نەکردبێت.

---

[1]) کاسێتی ئەمانەت.

[2]) کاسێتی ئەمانەت.

# سەرەتای خوێندن

زیرەكی و بلیمەتی و تامەزرۆیی(كاك ئەحمەد) بۆ خوێندن و زانست هەر لەسەرەتای منداڵییەوە دەردەكەوێت، لەوكاتەوەی تەمەنی لە(١٣) ساڵی تێپەڕی نەكردووە.

"كاك ئەحمەد، مرۆڤێكی زۆر زیرەك بووە، زیرەكی زۆر تەعریف ناكرێت، زیرەكییەكەی بەجۆرێك بووە، وەك خۆی دەیگێڕایەوەو دەیووت" زۆرێك لە كتێبەكانم تاكۆتایی نەخوێندۆتەوە، بەڵكو هەندێكیم لێدەخوێندەوە، ئەویتری بەپشت بەستن بەو پێشەكی و پێڕستانەی كە لەسەرەتاوە هەیان بوو دەمزانی باسی چی دەكات"[١].

عیشقی كاك ئەحمەد، بۆ فێربوون و خوێندن لە منداڵییەوە دەستپێدەكاتو سەرەتا، وەك هەموو زاناو كەسانی دیكە لە حوجرەی پڕ بەرەكەتەوە هەنگاوی یەكەم بەرەو خوێندن و وەرگرتن و كۆكردنەوەی زانست و زانیاری دەنێت، بەڵام دیارە لە ئەوەڵەوە خوێندن و وەرگرتنی زانیاری بەشێوەیەكی نەزم و تەرتیب نەبووە، سەرەتا لە(سنە) وانە دەخوێنێت، دواتر"ئەو دەرسەی دەمخوێند زۆر پەرش و بڵاوو نامونەزەم بوو، ئەوەیشی وا دەمخوێند تەقریبەن نەتیجەیەكی نەبوو"[٢] ، هەر ئەم حاڵە وای لێدەكات بڕیار بدات بۆخوێندن بچێتە(مەریوان).

"شەوقێك كەوتە سەرم، كە نەخێر بەوجۆرە شت فێر نابم! بڕیارمدا بچم فێربم. پێموابێت تەمەنم نزیكەی(١٣) ساڵ دەبوو، دەقیقتر بیرم نییە دەورووبەری ساڵی

---

[١]) چاوپێكەوتنی بڵاونەكراوەی نوسەر لەگەڵ ( كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان — سنە -٢٠٠٨

[٢]) كاسێتی نەمانەت.

(١٣٢٧)بوو، سەفەرێکم کرد بۆ(مەریوان) ڕەنگ بێت(٢-٣)مانگ لەوێ مامەوە، لەوەودوا ناردیانە شوێنمدا بردمیانەوە بۆ(سنە)، منداڵ بووم نەمدەتوانی بمێنمەوە، دیسان مودەت گوزەریا بۆ ساڵی دواتر ڕەنگە(١٣٢٨) بوو بێت، بەحەسرەتێکی یەکجار زۆر تا حەدێك شەوێك دەستم کرد بە گریان، "بۆ من هیچ لەئیسلام نازانم؟! بۆ بەدڵی دین نیم؟!"

دووبارە شەوق دای لەسەرم دەبێت بڕۆم، ئەم جارەیان دەبێت بڕۆم بۆ(عێراق) وەهابێت کە ماڵەوە نەتوانن بمهێننەوە*، چونکە ئەوکاتە هەر ئارەزوویان لێبوایە لەبەرئەوەی منداڵ بووم کەسێکیان دەنارد بەشوێنمداو دەیان بردمەوە.

کەوتمە ڕێ بۆ(عێراق). دیسان مێژووی چوونم بەتەواوی لە بیرنییە، بەڵام دەزانم کۆتای مانگی(هاوین)بوو بەرەو(پایز) دەچووین، تۆزە تۆزە هەوا بەرەو سەرما

*) دیارە یەکێك لەوهۆکارانەی وایکردووە سنە بەجێبهێڵێت و بەشوێن زانستدا بگەڕێ، جگە لەو تامەزرۆی بۆ زانست، خاڵێکی تری بریتییە لەئەوەی، وەك ئەشرافی ژیان بەسەر ئەباتو لەناو کۆڕی ئەشرافیاندا دانەنیشێت، کەدواتر بەهەموو هێزییەوە کار بۆ نەهێشتنی دەکات، دەلیلیش بۆئەم قسەیەمان ئەوەیە خۆی دەگێڕێتەوە"جارێکیان ئەفسەرێکی پایە بەرز کرابوو بەفەرماندەی بنکەی سەربازی(سنە)، ڕۆژێکیان باوکم پەیوەندی پێوەکردوو بۆ نیوەڕۆ خوانێك بانگهێشتی کرد. سەرەنجام حاڵەتی نا ئاسایی لەماڵەوە بەڕێ دەچێت، جۆرەها خواردن ئامادە دەکرێت(ئیسراف و تبزیر). کە خۆشیم لێی نەدەهات بەئاشکرا دیاربوو، بەتایبەت کە بیر دەکەمەوە لە خەڵکە مەحرووم و بێ بەشەی کە بەزەحمەت و بەنانەسکی دەژین. سرنجمدا سفرەکە زۆر بە دیقەت ڕێکدەخەن، پێنج جۆر گۆشت بەجۆرەها شێوە ئامادەکرا بوو پێنج جۆر برنج لێنرابوو، جگە لەجۆرەها شلەو زەڵاتەو سەوز....هەربۆیە لەناخی خۆمدا بڕیارمدا شەردبێت دەمی لێنەدەم. سەیر لەوەدا بوو کاتێك ئەفسەرەکە و هاوەڵانی هاتن سەرسامبوون دیار بوو سفرەی وایان نەدی بوو، بۆیە کەس دەمی لێنەدا تا وێنەگرێك هاتوو وێنەیەکی سفرەکەی گرت. ئیتر لە ناخمدا دەکوڵام و بڕیارم دا هەر (سنە) بەجێ بێڵم و بەشوێن زانستی شەرعیدا بگەڕێم ..

بورهان محەمەد ئەمین: کاك ئەحمەد موفتی زادە دڵسۆزی کورد و کوردستان، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ٢٠٠٧، سلێمانی، ل ٣٤.

دەچوو، بەڵام چ ساڵێك بوو، تاكەی ماومەتەوە، چەندێك ماومەتەوە؟ زۆر ڕۆشن نییە، تەسەور دەكەم لەكۆتای ساڵی (١٣٢٨)تا سەرەتای هاوینی ساڵی(١٣٣٠) نزیكەی دوو ساڵ لە عێراق بووم.

ئەو كەڵكەڵەو موشتاقە عەجیبە لەدڵما پەیدا بوو، ڕۆشتم ئەو ماوەلە دێهاتی كوردەواری مامەوە لە عێراق، تەنها مودەتێك نەبێت، كەلاموایە مانگێك دەبوو لە( سلێمانی) بووم لە مزگەوتی (بن تەبەق)، كە (مامۆستا مەلا موستەفای زەڵمی)هەورامان، مامۆستا بوو لە خزمەتی ئەودا بڕێك دەرسم خوێند، چەند شتێك ڕوویدا تاوای لێهات گەڕامەوە بۆ دیهات و لە گوندی(عەبابەیلێ) و هەڵەبجەو ئەوانە دەرسم خوێند[1].

موشتاقی و ئارەزووی موفتی زادە بۆ خوێندن و سەفەركردن لەبەر زانست لەو تەمەنە منداڵییەدا بەجۆرێك بووە، تەواوی ئەو بەربەستانەی وەلاوە ناوە لەماوەی گەڕان و خوێندنیدا هاتوونەتە ڕێگەی، ئەو برسێتی و ئێش و ئازارانەی هاتوونەتە ڕێی بەڕاستی مرۆڤ پرووكێن بوون، برسێتییەك خۆی دەڵێت"برسێتییەك بەتەواوی مانای كەلیمە سەختترین مانای برسێتی، كە تۆ تەسەوری بكەیت !". بەڵام ئەو دەركی بەوەكردووە لە جێگەیەكی دیكەوە برسییەتی، بۆیە هەوڵی داوە ئەو جێگەیە تێر بكات. ئەویش برسێتی بۆ زانست، بەجۆرێك تینوی عیلم بووە بە ناڕەحەتییەكانی جەستەی ڕاهاتووە ئەو بەو هەموو ترسەی تاریكی شەو بەرزو نزمی و شاخ و داخی كوردستان و وەڕە وەڕی(سەگ)ی هاری لادێكانی شارەزوور ڕاهاتبوو. ئەو دەركی بەوەكرد بوو خالقێك چاودێری دەكات و بەسەر ترسی منداڵیدا زاڵی كردووەو شەڕەكانی ڕۆژگاری خوێندنی بەخێر بۆ دەگوزەرێنێت.

---

[1]) كاسێتی ئەمانەت.

كاك ئەحمەد، لەوماوەیەی لە كوردستان دەبێت لەكاتێك لەكاتەكانی گەڕانیدا بەخزمەت زانای بەناوبانگی جیهانی ئیسلامی كورد(مامۆستا مەلا عەبدلوكەریمی مودەڕیس) دەگات و ماوەیەك لە شاخە سەركەشەكانی(تەوێڵە و بیارە)دا دەمێنێتەوە.

هەرلەبەر زیرەكی و لێهاتوویەتی لەو تەمەنە كەمەیدا كە(١٨-١٩)ساڵی تێپەڕی نەكردووە لەمانگەكانی ڕەمەزاندا دەبێتە مەلای مزگەوتوو ووتاری تایبەتو پڕمانا دەدات بۆ موسوڵمانان. ساڵێكیان ڕێی دەكەوێتە یەكێك لەو دێهاتانەو لە وتاری جەژندا كورتە بابەتێكی(قیامەت) پێشكەش دەكات و هانی خەڵكەكە دەدات بۆ دەستپاكی و دووره پەرێزی لە حەرام خۆری، نمونەیەك دەهێنێتەوەو دەڵێت:

"ئەی موسوڵمانینە كەس لە قیامەتدا لەبەردەم دادگای پڕ لە دادی خوایدا ناتوانێت نكۆڵی لە هیچكام لە كردەوەكانی بكات، چونكە دەست و قاچ و چاو و پێست ...هەمووی دێنە زمان، شتە دزراوەكان دێنە مەیدان و شایەتی لەسەر دزەكە دەدەن، بۆ نمونە ئەگەر كەسێك بزنێكی دزی بێت، بزنەكە دێتە مەیدان و شایەتی لەسەر دزەكە دەدات،-جا كاك ئەحمەد هەرئەوەندەی ئەوە دەڵێت-، كابرایەك وتارەكەی پێبڕیم و ووتی"مامۆستا....مامۆستا....بەڕاست خوای تەعالا بزنەكە زیندوو دەكاتەوەو ئاوا دەیهێنێتەوە مەیدان ؟!"

ووتم :بەڵێ، دڵنیابە.

كابرا ووتی"سابەخوا شتێكی باشە، منیش ڕیشی دەگرم و دەیدەمەوە دەست خاوەنەكەی"، ئیتر خەڵكەكە هەموو دایانە قاقای پێكەنین، جا كە پێكەنینەكەیان

نیشتەوە منیش تێمگەیاندن قیامەت شوێنی لێپرسینەوەیەو هیچ کردەوەیەك لەخوای گەورە پەنهان نییە و چی بچێنیت ئەوە دەچنینەوە"[١].

دوای ئەوەی ئەو کاتە دیاریکراوە لەکوردستان دەبێت و بە شوێن زانستدا ئەم شارو ئەو دێهات دەگەڕێت. خۆی یەکێکی دیکە لە ڕووداوەکانی ژیانی خوێندنی دەگێڕێتەوە، و دەڵێت"پێموابێت کۆتا زستانم بوو لە عێراق، لەناوچەی(سەرگەڵو) کە لەوانەیە بکەوێتە باکوری خۆرئاوای شاری(سلێمانی)یەوە برادەرێکم هەبوو(مەلا عەبدوڵای بانەیی)، بڕیار بوو لەلای من دەرس بخوێنێت، زۆر هانی دام، کە مەلایەکی خوێنەوار هەیە-خۆم بۆم باسکرد بوو کە ئارەزووم هەیە، مەلایەکی زۆر خوێنەوارم دەسکەوێت لای دەرس بخوێنم و شت فێر ببم-. بۆی باس کردم، وتی" بابچم بۆلای بزانم لەوێیە، ئەگەر لەوێش نەبوو لە(پشدەر) مەلایەکی باش هەیە دەچین بۆلای"، هەرچۆنێك بێت مەلایەکی باش پەیدادەکەین کە دڵخۆش ببین. ڕۆشتین سەفەری ئەو زستانە بە(ساڵی بەفرە زۆرەکە بەناوبانگە)لە وەودوا ڕووداوی سەیرو سەمەرە ڕوویدەداو بەسەرما دەگوزەرا، کە هەموویان عادی بوون".

بەوجۆرە کاك ئەحمەد، لەگەڕان بەردەوام دەبێت تا ئەوکاتەی لەلای باوکییەوە نامەیەکی حەسرەت ئاوەرو ئاگرینی پێدەگات و باسی ئارەزووی بینینی خۆیان و خەفەتی دایکی دەکات بۆی، بەئاواتی سەردانی(سنە) دەگەڕێتەوە، بەڵام ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ عێراق و لە(سنە) دەمێنێتەوە.

---

[١]) بورهان محەمەد ئەمین: کاك ئەحمەدی موفتی زادە(دڵسۆزی کورد و کوردستان)، گۆڤاری پەیامی ڕاستی، ٢٠٠٦، سلێمانی، ل٣٥.

# گەڕانەوە بۆ (سنە)

دوای ئەوەی ئەو دووساڵە لە(١٣٢٨-١٣٣٠ه.ك) لە کوردستانی عێراق سەرقاڵی خویندن دەبێت و لەزانستە شەرعییەکان شارەزادەبێت، دەگەڕێتەوە بۆ شاری(سنە)و لەوێ پێشوازییەکی گەرمی لێدەکەن و بەخێری دەهێننەوە. وەك خۆی دەڵێت"دووبارە لە (سنە) جەرەیان پێشهاتەوە".

دیارە کوڕێك بۆ ماوەی دوو ساڵ وولات بەجێ بهێڵێت و بۆ خوێندن هەزاران کیلۆمەتر ببڕێت و دواتر بگەڕێتەوە لەلایەن خزم و کەسوکارەوە چاوەڕێی چالاکی و زانینی ئاستی زانستەکەی دەکەن. کاك ئەحمەدیش بەهەمان جۆر، دوای گەڕانەوەی لە لایەن باوکییەوە دەخرێتە بەردەم تاقیکردنەوە، وەك باوکێك دەیەوێت بزانێت رۆڵەیەکی لێی دورکەوتۆتەوە و رۆژانە چەندین جار سۆزی باوکایەتی لەناخەوە سوتاندویەتی و هەزاران جار ئاه و ئاوات و حەسرەتی خواردووە نەمرێت و رۆڵە زیرەکەکەی ببینێتەوە، باوکێك ئەوەندە تامەزرۆی رۆڵەکەی بێت لە(سنە)وە خەڵك بنێرێت بۆ کوردستان و داوای لێبکات(کەواو سەڵتە)بۆ کوڕەکەی بکڕێت —خۆی ئەم رووداوە دەگێڕێتەوە"دوای ئەوەی هەواڵ دەچێتەوە بۆ(سنە)کە ئەحمەد(کەواو سەڵتەی) شڕو پیناوی لەبەردایە، باوکم یەکێك لە خزمانی خۆی نارد بۆ سلێمانی کەواوسەڵتەی تازەم بۆ بکڕێت.... ئیتر خزمەکەمان لەکۆڵم نەبوویەوەو دەستی بەرنەدام تا کردمی بەشاری سلێمانیداو کەواوسەڵتەی تازەی بۆ کڕیم "[1].دەی

[1]) بورهان محەمەد ئەمین، کاك ئەحمەدی موفتی زادە(دڵسۆزی کورد و کوردستان)، پەیامی ڕاستی، ل٣٥.

باوکێك ئەوەندە بەتاسەی کوڕەکەیەوە بێت، حەتمەن دەبێت لەکاتی گەڕانەوەیدا بزانێت چی لە هەگبەی زانیارییەکانیدایە.

دوای چەند ڕۆژێك لە گەڕانەوەی لەگەڵ باوکیدا دەچێت بۆ مزگەوتی گەورەی(دار الاحسان)، "ئەو ڕۆژە نزیکەی پەنجا فەقێ ئامادە بوون، کە باوکم ڕۆژانە دەرسی پێدەوتن، دیاربوو دەیویست تاقیم بکاتەوە، بۆیە ووتی"ئەمە ئەحمەدی کوڕمەو چەند ساڵێکە لە کوردستانی عێراقەو لەوەدەچێت بە زانستێکی فرەوە گەڕابێتەوە، حەزدەکەم لەمەولا لەباتی من ئەم دەرستان پێبڵێت، پێم باشە هەر ئێستا ناوی خوای لێبێنێ" و ڕووی تێکردم و ووتی"ئەحمەد فەرموو بزانم ...".

منیش ناوی خوام لێهێناو زۆر بەجوانی و ڕێك و پێکی دەرسەکەم وتەوە، هەستم دەکرد کە هەر هەمووی(تەوفیقی ئیلاهی)بوو، چونکە من خۆم ئامادە نەکرد بوو بابەتەکەش قورس بوو، جگە لەوەی ژمارەی فەقێکان زۆربوون و هەموویان لە ئاستێکی بەرزی زانستیدا بوون، بەو جۆرە وانەکە تا نیوەڕۆی خایاند، پاشان سەرنجی باوکمم دا ڕەنگی گەشابوویەوەو هەر سوپاسی خوای دەکرد.

دوایی پێی ووتم :ئەحمەد گیان، لە ڕاستیدا من ویستم تاقیتبکەمەوە، بڕوام وانەبوو ئەوەندە زانستی شەرعیت بەدەستهێنابێت"[1].

ئیتر بەوجۆرە تا ساڵی(١٣٣١) لەوانەوتنەوە بەردەوام دەبێت."تەقریبەن هێشتا هەر منداڵێك بووم خەتم نەدابوو-ئاماژەیە بۆ ئەوەی زۆر منداڵە-، زۆریشم مابوو بۆخەتدان، باوکم تەدریسی مەدرەسەی(دار الاحسان)ی مزگەوتی جامعەی

[1] بورهان محەمەد ئەمین: کاك ئەحمەدی موفتی زادە(دڵسۆزی کورد و کوردستان)، پەیامی ڕاستی،٢٠٠٦، سلێمانی، ل٣٥.

پێسپاردم، ڕەنگە ناسالّی(١٣٣٥)هەر لە(سنە) مامەوەو دەرسم دەوتەوە تادواتر چووم بۆتاران"[١].

سەركەوتوویی و خۆش هەڵسوكەوتی(كاك ئەحمەد)، لەگەڵ فەقێكان دەبێتە هۆی ئەوەی، فەقێكان بەشەوق و تاسەوە گوێی بۆ بگرن و هەوڵبدەن بۆ ئەمە كە(كاك ئەحمەد) بكەنە جێنشینی باوكی و هەر ئەم دەرسیان پێ بڵێتەوە، جگە لە زیرەكی و هەڵسوكەوتی جوانی، لەهەمانكاتدا كەسێكی گەنج بووەو توانیویەتی بەزمانی ئەوان قسە بكات و بەزمانی ئەو ڕۆژە بابەتەكان ڕوون بكاتەوە.

خۆی دەیگێڕێتەوە"زۆر ئازاد بووم لەگەڵ فەقێكاندا، كاتێك دەرسەكانمان تەواو دەكرد دەستمان دەكرد بە یاریكردن، ئەو یارییانەی گەنجی جوان دەكەن، شۆخی سەیر سەیر"[٢].

بەمجۆرە ماوەیەك لە(سنە) دەمێنێتەوە و دەسبەكاری خەبات و بانگەواز كردن دەكات، هەر لەوكاتەوە كێشەكان وورده وورده سەر هەڵدەدەن و ڕووبەڕووبوونەوەو قسەكردنی دەستپێدەكات، لە كاسێتی(ئەمانەت)ە كەیدا بەشێوەیەكی خێراو كورت، وەك ئەوەی زۆر ڕووداو هەبێت لەو كاتەدا، نەیەوێت ئاماژەیان بۆ بكات، باسێكی ئەوسەردەمە دەكات كەلە(سنە) بووەو دەرسی وتووەتەوە،"چەند ساڵ لە(سنە) كارمكرد موشكیلاتم بۆ پێشدەهات، ئەویش داستانی تولانی هەیە!! ئەو چەندساڵەی دوای ڕووبەڕووبوونەوەو هەراو بەزم وجەنجاڵی دروستكردن و ئیحساساتی(بانگەواز) كردن، هەندێك جار هەبوو كە خەریك بوو شەڕی زۆر قورس

---

[١]) كاسێتی ئەمانەت.

[٢]) چاوپێكەوتنی بلاّونەكراوەی نوسەر لەگەڵ ( كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان — سنە -٢٠٠٨

لە(سنە)دا دروست ببێت، ناشیانەو نەزانانە ئاخیری نائومێد بووم و تەسمیم گرت(بەرنامەم دارشت) بچم بۆتاران، پێموابوو لە تەنیشتی دانیشگاوە(زانکۆ) کەم کەم دەرس بخوێنم و بچمە ئەوێ باشتر دەتوانم کاربکەم.

بڕیاری ڕۆشتن بۆ تاران بەنیسبەت(کاك ئەحمەد)ەوە کارێکی زۆر گران نەبوو، چونکە لە لایەکەوە ئەم بڕیارەی لە پێناو ئامانجی خۆی بووە، لە لایەکی دیکەشەوە باوکی کاك ئەحمەد(مەلا مەحمود) لەوکاتەدا لە(زانکۆی تاران) مامۆستای(کۆرسی شافیعی) بووە.

کاك حەسەنی ئەمینی، دەگێڕێتەوە"لەکوردستانی ئێمەدا-ڕۆژ هەلات- دوو کەس ئەو عینوانی(مامۆستای فیقهی شافیعی) بووە. یەکێکیان باوکی کاك ئەحمەد،و ئەویتریان(مەلا ئاغای موهتەدی)-کەدواتر دەبێتە خەزوری کاك ئەحمەد-باوکی (عەبدولا و سەلاحی موهتەدی)، کە وەك مامۆستای دینی لەتاران دەرسیان وتۆتەوە. جا(مەلا مەحمود) لەوێ دەرس دەلێتەوەو پاش ماوەیەك کاك ئەحمەدیش دەچێتە ئەوێ، و لەگەل خوێندکارانی زانکۆدا پەیوەندییەکی گەرم و گوڕو پتەو دروستدەکات،-ئەمەیش یەکێکە لەنیشانەکانی کۆمەلایەتی بوون و شارەزایی کاك ئەحمەد لەمامەلەکردن لەگەل کەسانی بەرامبەردا، کە زۆر ئاسان توانیویەتی جێگەی خۆی لەدلیاندا بکاتەوە- لە زانکۆ خوێنکاران هەر پرسیارو شتێکیان دەبێت ئەم وەلامیان دەداتەوەو لە فەزای عیلمیدا خۆی دەردەخات، و کاتێك قسەدەکات بۆیان، دەزانن چەندێك زیرەك و لێهاتووە و لەکاتی وانە ووتنەوەدا لەگەل باوکیدا دەچێتە هۆلی موحازەرەوە، ماوەیەك لەگەل ئەودا و دواتر بەیناو بەین لەجیاتی باوکی وانە دەلێتەوە، لە کۆتایدا بەتەواوەتی خۆی دەروات دەرس

دەڵێتەوەو بۆ ماوەیەك لە زانکۆی(تاران) وەك مامۆستا لەبواری(مەزهەبی ئیمام شافیعی)دا دەرس دەڵێتەوە.

وەك خۆی باسیدەکات لەوکاتەدا کەسێکی زۆر مەزهەبی بووە، مەزهەبیانە بیری کردۆتەوەو لەسەر(سوننە) قسەی کردوە و دژایەتی زۆری(شیعە)ی کردووە، ئەمەش دیارە کاریگەری بارودۆخەی ئەو سەردەمەی لەسەر بووە، کە لایەنگرانی هەر دوو مەزهەب لەدژایەتی یەکتردابوون و هەمیشە دەسەڵاتی(شاهەنشاهی ئێران) کاری بۆئەوە کردووە دووبەرەکی و ئاژاوە دروست بکات، بۆیە دەبینیت قسەکردن و ڕووبەڕوو بوونەوە لەسەر مەزهەب لەوسەردەمەدا بەجۆرێکی زۆر فراوان سەرانسەری ئێرانی گرتۆتەوەو هەمیشە قسە لەسەر(سوننی بوون و شیعە بوون) بابەتێکی زیندوو بووە، هەر خودی کاك ئەحمەد لەو کۆڕەیدا، کە دوای ئینقلاب بۆ خوێندکارانی(کۆلێژی )لە زانکۆی(تاران) دەیگرێت، ئاماژە بەو دەردە کوشندەیە دەکات، هەر لەبەرئەمەشە کاك ئەحمەد زوو لەو هەڵوێستە کۆنو توندەی لەسەر مەزهەب هەی بووە پەشیمان دەبێتەوە، لە کۆتایدا بەتەواوەتی کار بۆ ئەوەدەکات کە جیاوازی(سوننە و شیعە) چارەبکات.[1]

بەجۆرە ماوەیەك مامۆستا دەبێت، بەڵام دواتر دەست لەکاری مامۆستای هەڵدەگرێت، چونکە لەلایەن(دەزگای ساواك)ەوە ڕێگری لەکارەکەی دەکرێت- لە باسی پەیوەندی کاك ئەحمەد و ساواك دا زیاتر لەمبارەیەوە قسە دەکەین-.

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# كاك ئەحمەد و پەیوەندی
# بە حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێرانەوە

پەرۆشی و دڵسۆزی كاك ئەحمەد، لەوماوەیەی لەتاران دەبێت وای لێدەكات لەیەك كاتدا چەندین كارو چالاكی ئەنجام بدات و هەموو هێزو توانای خۆی بخاتەكار بۆ هێنانەدی ئامانجەكانی خۆی و میللەتەكەی.

نەتەوەیی بوون لای موفتی زادە، لەگەڵ لە دایك بوونیدا دەستپێدەكات، چونكە بیرو بۆچونی وایە، كاركردن بۆ میللەت و كورد بوون، لەگەڵ كاركردن بۆ(دین) بابەتێك نییە لە یەك جودا بكرێتەوەو هەر یەكەیان بە جیاكاریان بۆ بكرێت* .

جیهانبینی تایبەتی كاك ئەحمەد دەربارەی بابەتی نەتەوەو نەتەوەیی بوون هۆكار بووە بۆئەوەی ئەو كاتەی لە تاران بووە، چەندین كارو چالاكی نەتەوایەتی ئەنجام بەدات، كە تەنها شایستەی پیاوی لێهاتوو بەغیرەتی، وەك ئەو بووە.

كاك ئەحمەد، خۆی لەبارەی كاتی سەرپەرشتیكردنی كۆمیتەی حیزبی دیموكرات بەمجۆرە قسەدەكات"لە ئەواخیری ساڵی(١٣٤٢) بوو لە تاران ڕەئیسی حیزبی دیمكراتی تاران بووم، كۆمیتەیەكی بوو لە تاران من ڕەئیسی ئەو كۆمیتەیە بووم، تائەو ئەندازەیە چالاك بووم بۆ حیزبی دیمكرات، جگە لەوەی لەوكاتەدا، لەگەڵ

---

*) بۆ زیاتر ئاشنابوون بەم بابەتە دەكرێت بگەڕێنەوە بۆ بابەتی(پەیوەندی نێوان نەتەوە و ئایین لەڕوانگەی-عەقیدە، جیهانبینی، ئەخلاقەوە)،سەروەت عەبدولا: كەلە ژمارە(٢٢)یساڵی(٢٠٠٩)ی، گۆڤاری(هەژان)دا بلاوكراوەتەوە.

ژمارەیەك لەكوردەكان ڕۆژنامەی(كوردستان)مان دەردەكرد، هەروەها لەڕادیۆی (كوردی تاران)یش كارم دەكرد كە مەتاڵیبێك هەبوو ڕوونم دەكردنەوە"[1].

كوردایەتی و هەستی نەتەوایەتی لەوكاتەدا ئەوەندە بەهێزبووە، لەناو تارانا هەمیشە جلی كوردی لەبەركردووە، كاك حەسەنی ئەمینی دەڵێت"كاك ئەحمەد، ڕۆژێكیان بۆی گێڕامەوە، ئەو كاتەی لە تاران بوو "لیباسی كوردی تەواو كوردیم لەبەردەكرد، ئەفسەری(نیروی ئینتیزامی) مەهاباتی لەتاران بوو، ئەویش كوردایەتی زۆر قەوی بوو، وەكو من وابوو. لەخیاباندا كە من لەپێشەوە بەلیباسی كوردییەوە دەڕۆشتم ئەویش لە دواوەوە بوو، جار جار لام بۆ دەكردەوە، هەر لامدەكردەوە تەحییەیەكی بۆ دەكردم، ئەو كە ئەفسەرێكی نیزامی بوو لیباسی نیزامی لەبەردا بوو، منیش كەلیباسی كوردیم لەبەردا بوو، ئەمەش دیارە لەبەر لیباسەكانم، چونكە كوردایەتیمان زۆر بەقوەت بوو"[2].

هەر ئەم كارو چالاكیی نەتەوایەتییەی موفتی زادە، دواجار سەرلەوەوە دەردەكات لەساڵی(١٣٤٢)*دا، خۆی و نزیكەی(١٢٠)كەس لە كوردە ناسیۆنالیستەكانی تاران، كە خەریكی كارو چالاكی بوون دەستگیر دەكرێن و دەبرێنە زیندانی ترسناو وەحشیەتناكی(ئەوین)لە تاران.

---

[1]) كاسێتی ئەمانەت.

[2]) چاوپێكەوتنی بلاّونەكراوەی نوسەر لەگەڵ(كاك حەسەنی ئەمینی )بەرپرسی مەكتەب قورئانی كوردستان – سنە -٢٠٠٨

*) كاك ئەحمەد خۆی دەڵێت: (١٣٤٢)، بەلاّم كاك حەسەنی ئەمینی لەیەك دوو شوێندا ئاماژە دەكات بەوەی كە قۆڵ بەست كردنی كاك ئەحمەد (١٣٤١) بووە .

گیران و فڕێدانە کوچە تاریك و ئینفرادییەکانی زیندانەوە لەبەر دینداریو ئیسلامەتی نەبووە، بەڵکو تەنها دوو خاڵ لە پشت گیرانی کاك ئەحمەدەوەیە ئەویش :[1]

١- لێپرسراوی حیزبی دیمکراتی کوردستان لە تاران .

٢- لێپرسراوی پەیوەندی نێوان حیزبی دیمکراتی ئێران و تورکیا.

ئەو هەموو ڕووبەڕووبونەوەو تەحەمول و دان بەخۆداگرتن و زانیاری نەدرکانەی کاك ئەحمەد، کە زیاتر لە(شەش) دانە مانگ بەردەوام دەبێت، لەبەر کوردایەتی و نەتەوەکەی دەبێت، لەبەر ئامانجێکە کە لەپێناویدا سەروماڵی دانا.

[1]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦،لا گ گ

# تەوەللودی دووبارەو موفتی زادەی نوێ[٢]

كاك ئەحمەد، دوای ئەوەی دەچێتە زیندان و لە ئینفیرادی توند دەكرێتو دەخرێتە ژێر ئەو هەمووە ئەشكەنجەو ئازارەوە، ئەشكەنجەو ئازارێك كە(د.عەلی شەریعەتی)دەڵێت" لە زیندانی(ساواك)دا هاوارو ناڵەی ئەشكەنجە دراوان بەتایبەتی لە شەودا بەجۆرێك بوو قابیلی تەحەمول نەبوو، شەوانە حاڵێك كە لەو زیندانەدا هەرچی تێدایە دەگاتە سنوری شێت بوون و خۆڕاگری پەرت دەبێت ....لە زینداندا هەموو پەیوەندییەكانی مرۆڤ، لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دەپچڕێت، بەجۆرێك ئەگەر بتەوێت وێنەی ژن ولامنداڵەكانت بێنیتەوە بەرچاوی خۆت ناتوانیت، یان قەدو باڵای دایكت بێنیتەوە یادت ناتوانیت، تەنانەت ناو و دەربڕینی وشەكانیشیانت بیرناكەوێتەوە...."[١].

موفتی زادە لەئاوا حاڵێكداو لەئاوا زیندانێكدا بۆ جارێكی دیكەو بۆ هەمیشەیی ئەستێرەی بەختەوەری هەڵدەبێت، وەك مەولەوی تاوگۆزی دەڵێت:

**هەركەس تەوەللود دووبارەش نییەن**

**ئەڵبەت سەعادەت ستارەش نییەن**

لەوێوە دووبارە لەدایك دەبێتەوەو بەوردی لەحاڵ و وەزعی خۆی و میللەتەكەی رادەمێنێت و ئەو وانانەی سەرداری مرۆڤایەتی(محمد)(ﷺ ) فێری دەكات ڕای دەچڵەكێنێت، و بۆ دواجار دەیخاتەوە سەر هێڵی فیترەت و هیدایەتی خۆی.

---

[١]) شا.لامعی: حكایت های از زندگی دكتر شریعتی(اجتیماعات اسلامیات-كویریات)، چاپی پێنجەم، ١٣٨٤، تهران .ل ١٦٤

ئەو ڕووداوانەی لەو زیندانەدا بەسەر(کاك ئەحمەد)دا ڕوو دەدەن گۆڕانکارییەکی وا قوڵی لەسەر دروست دەکەن لەکاتی (مەرەخەس)* بوونیدا ئیتر ئەو ئەحمەدەی پێش زیندان نابێت، واتە ئەو ئەحمەدەی پێش زیندان دەگیرێت زۆر جیاوازە لەو ئەحمەدەی دوای ئازاد دەکرێت.

جیاوازی نێوان ئەو دوو ئەحمەدە هێندەی جیاوازی نێوان ئەو دوو سەعیدە دەبێت (سەعید نورسی) پیێ دەناسرێتەوە، واتە(سەعیدی کۆن و سەعیدی نویێ)کە خودی(نورسی) لەزۆر شوێنی کتێبەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆدەکات، لێرەدایە دەکرێت بۆ(کاك ئەحمەدی)ش هەمان پلەبەندی و دابەشکردن دابنرێت و ناوی ببرێت بە(ئەحمەدی کۆن و ئەحمەدی نویێ).

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، دەربارەی ئەو گۆڕانکارییە فیکری و دەروونییەی لەزینداندا بۆی پێشهات و سەرلەبەری زیندەگی گۆڕی، لە شیعرێکدا دەنوسێت:

در آن جایکی درس آموختم　　　کز آن یك جهان فهم آموختم
شدم زان به وزع جهان آشنا　　　به صدها رموز نهان آشنا

---

*) مەرەخەس لە زمانی کوردیدا بە مانایی ئازاد بوون دێت، بەلآم دیارە قوڵی و فراوانی کاك ئەحمەد لە بەکارهێنانی چەمکەکاندا شتێکی چاوەڕوانکراوە، یەکێك لەو وردەکاریانەی کاك ئەحمەد لە بەرکارهێنانی چەمکەکاندا کاری لەسەر کردووە، بریتییەلە بەرکارهێنانی چەمکی (مەرەخەس) لەبەرامبەر چەمکی (ئازادبوون) لە زینداندا، واتە ئەو لە یەکێك لە پەیامە کۆتاییەکانی دوای مەرەخەس بوونی لە زیندا بە هاوەڵان و ئامادەبووانی دەڵێت، ئێوە وشەی ئازاد بوونم لە زیندان بۆ بەکارمەهێنن، چونکە ئازاد بوون بۆ کەسێك بە کاردێت کە زیندانی بێت، بەلآم من ڕاستە لەڕووی جەستەییەوە زیندانی بووم لە ناو چوار دیواردا، بەلآم لە ڕووی رۆحییەوە ئازادی ئازاد بووم!! لەبەرئەوە ئێوە دەکرێت وشەی مەرەخەس) بەکاربهێنن، چونکە ئەم وشەی زیاتر بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێت کەلە ڕووی جەستەییەوە کەسێك سنوردار بکرێت، بەلآم ئازادبوون بۆ گیراوێکە کە لە ڕووی رۆحی و جەستەییەوە گیرابێت!!

(ئاماژە بۆ ئەوەش بکەم، لە کتێبی دووەمدا لە باسێکی تایبەتیدا دەربارەی کۆیلەو کۆیلایەتی و جارییە زۆر ورد قسەی لەم بارەیەوە کردووەو ئەوەی ڕونکردۆتەوە،کە زیندانیکردنی جەستەو ئازادکردنی فیکر زۆر گەرەییە، بەلآم ترسناك و بەلآ ئەوەیە مرۆڤ لە ڕووی جستەوە ئازاد بێت و لە ڕووی زیهن و رۆحەوە زیندانیکرابێت....)

پێشوازییە عەجیبەی لێکرا وا دەنگی دایەوە. لەگشت جێگەیەکەوە خەڵکی پێشوازیان کردوو حازر بوون بە تەواوی وجودەوە هاوکاری(مەدرەسە)بکەن و بێن دەرس بخوێنن و لەئیسلامی واقیعی شارەزابن و بزانن ئیسلام ڕێگەی ڕووبەڕوو بوونەوەیە، ئیسلام ڕێگەی قبوڵنەکردنی زوڵم و لەناوبردنی زاڵمانە.

ئەم چالاکیانە وورده وورده خەریك بوو توانایی پەیدا دەکرد، کە ئەم ئینقلابی ئێرانە هاتە بەرەوە. بەڵێ ئینقلابی ئێران حەقی میللەتی ئێران بوو دوای (٢٥٠٠) ساڵ لە زوڵمی شاهەنشاهی نەجاتی ببێت، بەڵام بەداخەوە ئینقلابێك فرە سەتحییانە بوو بێ پایە بوو، شتێك بوو هەروا وەك ئاگر لە کوتوپڕ بڵێسە بکێشێت، وەك پوشێك ئاگری تێبەر بدەیت بەوجۆرە میللەت ئەوەندە توڕە بوو لەدەست زوڵم و فەسادی شاهەنشاهییەوە گشتی سەر تا خوار ڕاپەڕی. حەقیقەتی ئەوەبوو(هەرچەندە ئەم ڕاپەڕینە هۆکاری ڕزگاری ئێران بوو)، بەڵام بۆ من زۆر کاریگەرهێن بوو کە ئێمە بنەڕەتی یەك قیام و ئینقلابێکمان دانابوو، کە لە داهاتوودا، بەڕاستی بتوانێت لە هەرچی بارەوە، هەم میللەتی کورد هەم میللەتان ڕزگار بکات، بەڵام چی ئەمانە ئا بەم ئینقلابە سەتحییە بردیان بەڕێوە، کەئەو ئینقلابە بونیادییە ئەو کارە ئەساسییەیە کە ئێمە کردبوومان ڕووبەڕوو ببێتەوە، لەگەڵ کۆمەڵێك موشکیلا کەباسی دەکەن. سەیری ئینقلابەکانی دونیامان کردوە، لەئەم ساڵانەدا لەو کاتەوە کەئیتر داگیرکەر تازە پەیدابووە، لەبەرامبەر ئیستیعماری گەورەی غەربەوە کە ئەمەریکا ئێستا بووەتە سەرداری، لەم لاشەوە شورەوی-سۆڤییەت-بۆتە سەرداری، جۆرێکی دیکە لەئیستیعمار و وڵات داگیرکردن لەو زەمانەوە ئەمانە بەوجۆرە دەسەڵاتیان پەیداکردووە بەسەر ئەم وڵاتە بەدبەختە بێچارانە لەهەر شوێنێکدا حەرەکەتێك کرابێت تەکانێك

درابێت، بۆئەوەی میللەت ئازادببێت لەژێر دەستی حوكومەتێك، كە ئەم حوكومەتە نۆكەری ئەو ئیستیعمارانەیە بەجۆرەها دەسكیسگەل داویانە بەسەریانداو نە یانهێلاوە سەر بەرزبكەنەوە. هەرئەم میللەتی ئێرانە چەندین جار حەرەكەتی دەستپێكردووە هەر بەكرێگیراوان داویانەتە سەریاناو خەفەیانكردووە. مەسەلەن ڕووداوی(سەرداری جەنگەڵ) ئینقلابی(جەنگەڵ) ئینقلابێك بوو بەڕاستی پتەو عادلانە مەنتقی ڕێك و پێك لەوانە بوو لەم ئینقلابەی ئاخیریش ئایندەی باشتر بوایە، چونكە وورده وورده‌و تەدریجی دەڕۆیشتە پێشەوەو هەر لەبەرئەوە مەحكەم ڕێگەی دەبڕی. لەوكاتا ئینگلستان فرە زۆرداربوو لە (ئێران)دا، (ئینگلستان و ڕوس) شورەوی سەردەمی(لینین). -لینین-ێك، كە خەڵكی وا دەزانن واقعانە فریادڕەسی مەردمە. كە نامەكانی ماوە چی دەسیسەیەكیان گرت بۆ لەناو بردنی ئەم ئینقلابە –(ڕەزاخان)ی دوابراویان هێناو دەسەلاتیان پێداو خستیانە سەركارو(لینین) موكەڕەر سفارشی-پەیام-ی نارد و نوسی بۆ(سەرداری جەنگەڵ)، كەدەبێت تەسلیم ببیت، چونكە ڕێكەوت بوو لەگەڵ ئینگلستانا میقدارێك سودی تێدابوو بۆ(شورەوی). (ئینگلستان) پەیمانی دابوو لە(ئێران) دەستیگیربوێت-پاشەكشەبكات-، كەلەوانەیە حەدی ئەكسەر (ئەوكاتە قیمەتی ملیۆنێك بوو لەساڵێكا-واتە دەكرێت بڵێین قیمەتی(٥٠٠-٦٠٠ ) هەزار تمەن سودی تێدا بووە، لینین بە(٥٠٠هەزار تمەن)سود كە ئینگلستان پێیدا لەسەرمایەی(ئێران) نەك هی خۆی، ئینقلابی ئێرانی فرۆش. (سەرداری جەنگەڵی) فرۆشت و ئێرانی بەدبەختكرد.

یان ساڵی(١٣٣٢) لەبابەتی(نەوت)دا، كەئەم دووانە زۆر گەورە بوون لەئینقلابی ئێراندا هەرچەند بەو مەحكەمی و پتەوییە ئینقلابی(جەنگەڵی) سەری نەگرت،

بەڵام بەڕاستی تەواوی میللەتی خستبوویە جموجوڵ. خەریك بوو میللەتی ئێران هەم لەدەستی(شاهەنشاهی) و هەم لەدەست تەڵەی ئیستیعماری(ئینگلستان) ڕزگاری بوێت. لەو کاتە ئەمەریکا دەستەلاتی پەیدا نە کردبوو لەئێراندا.

لەو کاتا(ئەمەریکا) هەوڵی دەدا لەئێراندا وەك لەزۆر جێگەکانی دیکە بتوانێت شوێن پێی خۆی بکاتەوە. کەهاوپەیان و دۆستن پێکەوە، بەڵام خۆ ئەمانە شەرەفییان نییە، وەك کۆمەڵێك دزو تالانکەر کەهاوپەیانن بۆ دزی بەیەکەوە، بەلام هەرچی بتوانن کلاو دەنێن سەری یەکتری، هەتا یەکتری دەکوژن ئەم ئیستیعمارگەل بەوجۆرەن. کەرەکی بوو بەهەر جۆرێك بێت جێگەی ئینگلستان لێژبکات و خۆی جێگەی بگرێتەوە.

بەهەرحاڵ ئینقلابی(ئێران) سەری دەگرت. بەڵام بەوجۆرە ئەو ئینقلابەیان وردکرد لەرێگەی سەرلەشکری(زاهدی) کە(شا)یان هێنایەوە بەوجۆرە چەندین(دە) ساڵ میللەتی ئێرانیان خستەوە ژێر چەپۆکی زاڵم لەساڵی(١٣٣٢) بۆ ساڵی(١٣٥٧)، دووبارە تالانی مەملەکەتەکە کرا. ئەم نۆکەرەیان دانا پاسیان بۆ-چاودێری- بکات و خۆیان مەملەکەت تالانبکەن.

لەزۆرێك لەجێگەی دونیادا، هەرکات میللەت ویستوویانە حەرەکەتێك و تەکانێك بدەن بە خۆیان و لە ژێر چەپۆکی ئەم زاڵمانا بێنە دەرەوەو نیشانی ئەدات-وەك ئەم ئینقلابە لە ئێرانا کەوتۆتە ڕێ- خەتەرگەلی گەورە گەورەی بۆدروست دەبێت هەروا کارێکی ئاسان نییە، ئەگەر ئەو ئینقلابە وا ئێمە خستبوومانە ڕێگەوە ئەو حەرەکەتە وا بە تەدریج و وورده وورده دەڕۆشتە پێشەوە هەروا بڕۆشتایەتە پێشەوە حیسابمانکردبوو لای کەم(١٠-١٥) ساڵی تری دەویست، کەمیللەتی کورد بەباشی و وردی حاڵی بێت لەحەق و ناحەق. حیسابی حاڵی بوێت لەعەدالەت و زوڵم، حیسابی حاڵی بوێت لەئیسلام و دەربار و تەکیەو خانەقاو جیاوازی ئەمانە بناسێت

و جیایان بکاتەوە، تێبگات چ زوڵمێکی لێکراوە، چ بەشگەلێکی خوراوە، ئەمانە بەباشی دەرك بكات.

بەڕاستی کاتێك حەرەکەتی ئینقلابی دەستی پێکرد بەتەواو تواناوە بڕواتە پێشەوە لەوانەیە نەك تەنها میللەتی کورد، بەڵکو باقی میللەتی مەحرومی ئێرانیش گشتی ڕزگار بکات. حەتا ئیحتیماڵی ئەوەش بوو میللەتی کوردی بێگومان ڕزگار دەکرد، چونکە مەحکەم دەڕۆشتە پێشەوە، وەك منداڵێك بەتەدریج و وردە وردە دەرسی پێ بڵێیت تا شپرز نەبێت. تا لەئاخرەوە زۆر زیرەك و زۆر بە توانا دەبێت و زۆرباش حاڵی دەبێت، حەرەکەتی ئینقلابیش بەوجۆرەیە، هەروەك ئەوەی ئێمە لەساڵی(١٣٢٣)دەستمان پێکردوو لەساڵی(١٣٥٦)دا دەستمانکرد بەدامەزراندنی (مەدرەسەی قورئان)و حیسابمان کرد بوو لای کەمی(١٠-١٥) ساڵی تردەبێت کاربکەیت تائەو کاتەو بڵێین میللەتی کورد هەڵسەرەوە بۆسەندنەوەی حەقی خۆت، بۆئەوەی ئیتر لەژێر زوڵم بێیتە دەرەوە، وردەوردە لەڕووی(دینییەوە فکرمان ڕۆشندەکردەوەو لیباسی کوردیمان لەبەردەکرد، و مەسەلەن هەندێك گەنجی بەئیمان دەهاتنە لامان و پێیان عەیب نەبوو (پانتۆڵیان) لادەبردوو(شەرواڵیان) لەپێدەکرد، کەسی واهەبوو (ماستەر و دکتۆرای)هەبوو پێی عەیب نەبوو، چونکە قبوڵی بوو شەرواڵی لەپێدەکرد، تاوردە وردە میللەتەکە خۆی لەبەرچاوی خۆی موحتەرەم ببێتەوەو فەرهەنگ و لیباسەکەی خۆی ئیحترام پەیدا بکات. ئەم کارە کەئێمە لە(سنە)ەوە دەستمان پێکردبوو وردە وردە بڵاو دەبوویەوە.

لەهیچ شوێنێکدا خەبەرێك نەبوو، لەگشت شوێنێکدا شێخ و مەلاکان گشتی ناتوانا، شێخەکان گشتی جاسوس بوو، ئەصڵەن کاریان هەر جاسوسی و خیانەت بوو، مەلاکانیش هەندێکیان بووبنە جاسوس و خائین و دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو مەرتەبەی بەرزی حوکومییان هەبوو، باقی مەلا فەقیرەکانیش دەسەڵاتیان نەبوو

هیچیان پێ نەدەكریا، هەم لە ڕووی داراییەوە هەژار، هەم لە ڕووی سیاسیەوە هیچ قودرەت و ڕێزێكیان نەبوو كارێك بكەن. وردە وردە خەریك بوو بلاوەبوویەوە میللەتی كورد وریا ببێتەوە. بزوتنەوەیەك بەوجۆرە بڕۆشتایە لەكۆتاییەوە جێگەی ئومێدبوو، ئەما ئەم ئینقلابی ئێرانە دروستبوو، وەك بەعزە باوك و دایكێك ناشی منداڵەكەیان نەخۆشە، یان زەینی كۆڵە-لەبەركرنی زانیاری زەعیفە- لەشتێكدا زۆری بۆدەهێنن دەڵێن"دەبێت یەلا بخوێنە". یان هەندێك مامۆستای ناشی نەلەڕووی ئوصولەوە. (منداڵێك ئەگەر تەمەنی بێت ئەبێت هانی بدەیت و ئاگاداری بكەیت بخوێنێت)، بەلام تەمەنی ناكات هەوڵ دەدات بخوێنێت، ئەما حاڵی ناوێت كێشەیەك لە زهنیدایە، لەبەرنامەی بەردەستیدایە. لەمامۆستاكەیدا، ئەمان هەر زۆری بۆ دەهێنن ئەوەنەی تر ناڕەحەت دەبێت و سەیردەكەیت دوای ماوەیەكی تر فیراردەكات و ئەصڵەن واز لەخوێندن دەهێنێت، لەوەودوا دەڕوات بۆ ئیشكردن و كرێكاری، تەنها لەبەرئەوەی لەدەست خوێندن خۆی نەجات بدات.

ئینقلابی ئێران، وەك ئەم بەرنامە سەتحیانە بوو، وەك ئەوەی زۆر بهێنی بۆ منداڵێك كەدەبێت هەر خوێندەوار و زیرەك بێت، بە پەلە بوو-میللەتی بەپەلە خستە ڕێ، لەكاتێكدا دەبوو ساڵەهای ساڵ درێژەی بكێشایە، بەهەر حاڵ نیگەران بووین ئەم ئینقلابە سەتحییە ببێتە هۆكاری ئینقلابەكەی ئێمەش، ئەمەش لەبەرئەوەی كاتێك سەتحییانەیە-ئینقلاب- ناتوانێت خۆی لەدەستی پیلانی ئیستیعمارەوە بپارێزێت.

ئەم دوا بڕیاگەلە(بەریتانیاو سۆڤییەتو ئەمریكا )چۆن ئینقلابی جەنگەڵیان شكستدا، چۆن ئینقلابی نەوتیان شكستدا، چۆن بزوتنەوەكانی دیكەی ئینقلابی لەئێراندا بەردەوام بووە. وەك(مشروتە)، چۆن بزوتنەوەی گەورە لەدونیادا بووە، كە بوویانە گەشتۆتە سەركەوتنی گەورەو ڕوخاندویانە، ئینقلابی ئێرانیش دووچاری دەردی سەری و موشكیلە دەبێت، هەر لەئەوەڵەوە ئەم نیگەرانییەمان هەبوو، وەك

ئەوە وایە(کانی ئاو)ێك، یان کارێزێکت هەبێت(١٠-١٥) ساڵ بکەویتە شوێنی و چەندین کیلۆمەتر لەئەم لاو ئەولاوە بڕۆیت کە بتوانێت ئاوێك هەمیشەیی و بەردەوام کەئیتر نەبڕێتەوە دەستەبەری بکات، بەلاّم لافاوێك لە پڕدا بێت کارێزو و هەرچی شتە تۆ تازە دەستت پێکردووە گشتی دامالێت و لەناوی بەرێت، کاری ئێمە کاری ئەو کارێزە بوو، دوای ساڵەها ببێتە کارێزێك و نە بڕێتەوە، بەلاّم ئینقلابی ئێران لافاو بوو. لافاوێك هات کردییە هەرا و کەسافەت و جەنجاڵ و زەحمەتی ئێمەشی بەربادا و لەناوی برد.

هەر لەئەوەڵی ئەوەڵەوە نیگەران بووین شتێك بەو جۆرە پێش بێت، جا میللەتی کورد بەڕاستی، ئەگەر ئەم ئینقلابی ئێرانە سەری هەڵنەدایە و دوای(١٠-١٥) ساڵی دیکە ڕوی بدایە دەبوویە ڕەهبەری ئەم ئینقلابەی ئێران، دەبوویە پێشڕەوی ئینقلاب، چونکە سەیرت دەکرد ئەو بزوتنەوە ئینقلابیە بەرلەوەی ئینقلابی ئێران دروست ببێت لە کوردەواریدا بوو-لەهیچ شوێنێکی ئێراندا نەبوو- ئابەو جۆرەی (مەدرەسەی قورئان) دروست بوو وردە وردە خوێنەوار و نەخوێنەوار و ژن و پیاو کور و کچ پەروەردە دەکران و حاڵی دەکران لە حەقیقەتی ئیسلام و مەسیری ئینقلابی ئیسلامییان پێ نیشان دەدرییا کەهیچ جۆرە زوڵمێك، هیچ جۆرە ناڕەحەتییەك لە ئاییندەدا قبوڵ نەکەن، ئەو جۆرە ئیسلامەی ئێمە پێمانیان حاڵی دەکرد، کە هەتا لە بەرامبەر کەسێکەوە بوێتی ئەمە واتای(شیرکە)، هەتا ئەمە یەك نەفەر عەبایەکی بوێت، مێزەرەیەکی بوێت و بەوە خۆی جیا بکاتەوە لەخەڵك ئەمە گوناه و مەعصییەتە، ئەمە(فەخر) فرۆشییە، هەتا ئەمە یەك نەفەر لەقەبی هەبێت و پێی بڵێن(مەلا-سەید_حاجی_شێخ)و ئەم لەقەبە ماقوڵتری دەکات لەخەڵك و شانازی پێوە دەکات، ئەمە گوناهە، ئەمانە گشتی باتڵە و ئیسلام دەبێت هەموو ئەمانە لەناو بەرێت. تەواوی مرۆڤەکان دەبێت یەك پلەیان هەبێت

لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە، بان و خوار نەمێنێت، ماقوڵو ناماقوڵ نەمێنێت، لەقەب و ئیمتیاز و عەلامەت و مەدالیا نەمێنێت. ئـا بەوجۆرە بەموحکەمی خەریك بووین میللەتی کوردمان حاڵی دەکرد، بەڕاستی ئەم میللەتە دەیتوانی ببێتە ڕەهبەری ئینقلاب بۆ تەواوی ئێران، ئەگەر بەوجۆرە بچوایەتە پێشەوە، بەلاّم هێشتا ئیسلام ڕوون نەکراوەتەوە، هێشتا سەرەتای کارە. لەکتوپڕا ئەم ئینقلابەی ئێران دەرکەوت. چەندێك نیگەران بووین!! خوایا ئەم ئینقلابە، بەڵێ....

بە هەرحاڵ، حەقی میللەتە و میللەت تورەبێت و خۆی ڕزگار بکات، بەلاّم لەبەرئەوەی بێ بنەڕەتەو هەوڵێکی عەجولانەیە ئاخری شتێکی ڕێك و پێك نابێت و دەبێتە هۆکاری لەبەین بردنی ئینقلابەکەی ئێمەش.

ئەگەر ئێستا باسی ئەوە بکەم چی پەیوەندییەك لەنێوان ئینقلابی ئێمەو ئینقلابی ئێرانا هەبووە و چۆن ئەم ئینقلابەی ئێران بوویە باعیسی ئەم ئینقلابەی ئێمە. ئەمە دوورو درێژو لەبارەیەوە نادوێم.

بەلاّم بەکورتی ئەوەی هۆکاری نیگەرانی بوو چی بوو؟ ئەمە بوو، دەمزانی کاتێك ئەم ئینقلابە دروست دەبێت یالاّ وەك ڕابردوو خۆپیشاندان و پێکدادان و دەزگای جاسوسی دەکەونە کار دژی ئینقلاب کە لەناوی بەرن، چونکە ئەم هێزە ئیستیعمارییەی باسمانکرد، هەرچەند دژایەتیان هەیە بەیەکەوە، بەلاّم هاوڕان لەوەی نە هێڵن هێزێکی دیکە پەیدابێت و کەسێکی دیکە پەیدا ببێت و قسە بکات، لەبەرئەوە هەر دووکیان دەستدەخەنە دەستییەکەوە بۆسەرکوتکردنی ئینقلاب، هەروەك چۆن (ئەمریکاو شورەوی چین-کە تازە دەستیپێکردووە بۆ دونیا تالاّنکردن-)هەرسێکیان دژی ئینقلاب قسەیان دەکردو و پاڵیان دەدایە پاڵ(شا)وە و پارێزگاریان لێ دەکرد، ئەمە دەلیل بوو دوای ئەوە ئینقلاب سەرکەوێت، ئەمانە گشتی یەك دەنگن بۆئەوەی ئینقلاب لەناو بەرن و(شاە) بهێننەوە، یان(شاە) نەبێت

نۆکەرێکی تر بۆ ئەوان فەرق ناکات، چونکە ئەوان ئەوەندە وەفادارنین بۆ نۆکەری خۆیان گرنگ ئەوەیە نۆکەرێك دانێن ئەمین بێتو خەیانەت لەمیللەت بکات و خزمەت بکات بەئەوان. هەموو ئەمانە لەزهنمدا ڕۆشنبوو، ئینقلابێك ئاواسەتحیيانە بڕواتە پێشەوە دەرەقەتی ئەم گشتە دەسیسەو پیلانانە نایەت بەتایبەتی لە(کوردەواریدا).

لەجێگەکانی دیکە شەرایەتییەکە جیاوازە ناوچە سەر سنورییەکان جیاوازە لەناوچە سەنتەرییەکان ئەو حەساسترە، لەناوچەی سەنتەریدا خەتەریات کەمترە وەك لەناوچە سەر سنورییەکاندا. ئەم گشتە هێزە دەتوانن ئاسان دەستێوەردان ئەنجام بدەن. جگە لەوەش میللەتی کوردیش ئەوەندەی مەحرومییەتی دیووە ئەم حەرەکەتەی ئێمە لەم چەند ساڵەدا نە یتوانیوە ئازا-خێرا-ئاگاداری بکاتەوە، زەمانی مابوو تا بەتەواوەتی زیندوو ببێتەوە. ئیتر بەهیچ شێوەیەك نامەردی قبوڵ نەکات و هیچ درۆ قبوڵ نەکات و لەبەرامبەر زۆرو زوڵمەوە سەر نەخەوێنێت. بەڕاستی مابووی میللەتی کورد بگاتە ئەو حاڵەتە، نیگەران بووین، ئەگەر بێتو باقی ناوچەکانی ئێران زۆر توشی کێشە نەبن لە دوای ئینقلاب، بەڵام ناوچە سەرسنورەکان کەرێگەی هاتووچۆی ئەمریکاو شورەوی و نۆکەرەکانیانە، و بەتایبەتی کوردەواری لەلایەکەوە(عێراق و لەلایەکەوە (تورکیا)، حیزبی (بەعسی) عێراقیش دەناسین، و دەزانین چی دوژمنێکە بۆ میللەتی کورد!! چۆن بەناوی دڵسۆزی قوردەکات بەسەر میللەتی کوردا و دەزانین چی بەلایەکی بەسەرماندا هێناوە، بیری ئەوەمدەکردەوە، بەیانی میللەتی کوردی بێ چارە کەهێشتا دۆست و دوژمنی باش نە ناسیوە، هێشتا وریا نە بۆتەوە، ئەگەر ئینقلابێك ڕوویدات ئەم گشتە دەزگا جاسوسیگەلە(سەگەکانی خۆیان) بەربدەنە وڵاتی کوردەواری، میللەتی کوردی بێ چارە لەژێر چەپۆکی ئەمانەدا چی بکات؟ ئەگەر لەلایەکەوە دڵخۆشبین ئینقلاب

ئەبێتە باعیسی ئەوەی میللەتی كورد لەژێر چەپۆكی شاهەنشاهی ڕزگاری ببێت و ئەم گشتە فەقیرو بەدبەختییەی هاتووە بەسەریدا تەواوبێت و ئاخری ڕووی ئاسایش و خۆشی ببینێت و سەر بەرز بكاتەوە و فەرهەنگ و زمانی میللەتی خۆی بناسێنێت بەدونیا، وەك هەرچی میللەتی دونیایە بەڕەسمێك كە لەئیسلامدا هەیە ئازادی خۆی و ئیختیاراتی خۆی لەدەستی خۆیدا بێت، لەبەرامبەر ئەمەوە ئەم نیگەرانییە هەیە، چونكە هێشتا ووریا نە بۆتەوە و دۆستی و دوژمن لەیەك جیاناكاتەوە، لەلایەكی ترەوە دووبارە(ئینگلستان) لەلایەكەوە(ئەمریكا) لەلایەكەوە(شورەوی)، لەلایەكەوە، نۆكەرەكانیان كە(ئیسرائیل)ە، (میصرە-بەعسی عێراق)ەو لەولاوە هاودەستەی (شاه)، كەهێشتا لە ئێرانا ماون. ئەمانە گشتی دەستبدەنە دەستییەكەوەو كوردستان بكەنە جێگەی ڕەفتارو پیلانی خۆیان و میللەتی كوردی بێ چارە لەجیاتی ئەوەی سەر بەرزبكاتەوە ڕووی ئاسایش و خۆشی ببینێت ئەوەنەی تر زیللەت وبەدبەختی و فەقیری و دواكەوتوویی یەخەی دەگرێت. ئەمە نیگەرانییەك بوو لە دڵما كە بەڕاستیش وابوو.

هەر لەگەڵ حوكومەتی(شاه) تەختی لەقبوو كەوتە ئەوەی بڕوخێت و دەسەڵاتی نەما، سەیرتكرد لەملاوە یەكێك سەری بەرز كردەوە لەولاوە یەكێك سەری بەرز كردەوە، شتگەلی ئینقلابی و مرۆڤی ئینقلابی دروست بوو، لەكاتێكدا سەیر دەكەیت بەر لەوەی دەسەڵاتی(شاه) لاوازبێت لەسەرانسەری كوردەواریدا یەك جێگە نەبوو ڕەسمی و ئاشكرا دژی حوكومەت قسەیەك بكات، نەمەلایەك، نەشێخێك، نەمامۆستایەك، نەكارمەندێك ، هیچ مزگەوت و مەركەزو قوتابخانەیەك نەبوو بەشێوەیەكی ئاشكرا حەقیقەت بڵێتە خەڵكی و خەڵكیش حاڵی بكرێت لەخیانەتی حوكومەت. تەنها هێزێك لەتەواوی كوردەواریدا هەبوو ئێمە بووین، لەكاتێكدا باقی مەلاكان، وەك ئەم(مەلا شێخ عزدین)ەكە ئیمام جومعە بوو لە(بۆكان)دا،

لەگەڵ كۆمەڵێك لەبرادەران چوین بۆ دیدەنی، (خۆشمدەویست)، چونكە جیاواز بوو لەگەڵ مەلاكانی تردا كەمێك جیاواز بوو، مەسەلەن ئیمام جومعەكانی تر سەعاتێك بەكوردی دەهاتن بەقەدو بالآی (شاه)دا، بەلاّم ئەو تەنها لە وتارە(عەرەبی)ەكەدا دوعای خێری بۆ(شاه) دەكرد. ئەمە جیاوازی بوو لەبەرئەوە خۆشمدەویست، چونكە كاتێك ئیمام جومعەكانی كوردەواری گشتی بەوجۆرە بوون ئەو كەئیمام جومعە بوو لەكوردیدا دوعای خێری نەدەكرد بۆ(شا)و تەنها لەعەرەبیدا دوعای دەكرد ئەوە یەكێك بوو بووە هۆی ئەوەی خۆشمبوێت، شتێكی تریش كە بوویە، هۆی ئەوەی خۆشمبوێت ئەوە بوو، لەكاتێكدا مەلا و شێخە دەوڵەتیەكان دەستیان دایە دەستی یەكەوەو تۆماریان دروستدەكرد دژی من، كە ساڵەها ئەمە كاریان بوو. ئەمە كۆمۆنیستە، ئەمە لامەزهەبیە، ئەمە مونافیقە، ئەمە كافرە، بردبویان بۆلای بۆ(سابلاّخ) (مەلا شێخ عزالدین) ئیمزای نەكردبوو لەبەرئەوە واقیعەن خۆشمدەویست، ئەو ئەوەندە شەهامەتی هەبوو، لەگەڵ ئەوەی ئیمام جومعە بوودو لە تەرەف شاوە دانراوەو حوكمی(شاه)بە دەستیوەیەتی هێشتا ئەوەندە شەهامەتی هەبێت، كەمەلاكانی دەوڵەت بڵێن ئیمزای بكەن و ئەو ئیمزای نەكات، بوویە مایەی خۆشەویستی و ڕێزم بۆی، بەهەرحاڵ پەیوەندییەكی دۆستانەمان بوو، لەگەڵ هاوڕێیاندا چوین، وا ڕێكەوت جومعە هاتە پێشەوەو چوین لەجومعا دانیشتین، كاتێك گەیشتە ئەوەی لەعەرەبیدا دوعایكرد بۆ(شاه)، هاوڕێكان ناوچاویان دابەیەكدا، منیش تا ئەوكاتە.نە چوویبوومە خوتبەی جومعەی، لەڕاستیدا نە مزانی بەوجۆرە دوعادەكات دەستمان بەرزكردەوەو (ئامین)ماندەكرد لەپڕ سەیرمانكرد دوعای بۆ شای مەلعونكرد دەستمان داگرت لەوەودوا هاوڕێیان وەختبوو كەچەڵم بكەن، ئەمەیە پیاوە خۆشەویستەكەت؟ ئەمەیە مەلا خۆشەویستەكەت كە بەعەرەبی دوعای خێردەكات بۆ شا؟!

منیش دەستمكرد بەتەئویل ئاخر چی بكات، دەسەلاتە، پارەی نییە خاسترین مەلای ڕەسمی لەناو مەلاكاندا(ئەگینا زۆر مەلای بەئیمانمان هەبوو لەگۆشە جێگەیەكدا، بەلاّم دەسەلاتیان نە بوو كارێك بكەن)، بەلاّم لەناو ئەو مەلانەی (شاە) دەسەلاّتی پێدابوون، باشترینیان(مەلا شێخ عزالدین) بوو. باشیەكەشی ئەوە بوو بەكوردی دوعای خێری نەدەكرد بەعەرەبی دوعای خێری دەكرد، زۆر بەكوردی نە دەهاتە شان و باڵیا، ئەمە وەزعی كوردەواری بوو باقی تریش وەزعیان مەعلوم بوو.

دەی سەیرمانكرد لەگەڵ حوكومەتی(شاە) تەق و لەق بوو، زۆر و دەسەلاّتی نەما، لەگشتلایەكەوە مرۆڤی ئینقلابی بەرز بوونەوە، گروپی ئینقلابی سەریانهەڵداو (چەكوش و داس ) چوو بە ئاسمانا!

نە یانهێلاّ میللەت حاڵی بێت، ئەی هاوار(داس و چەكوش)یانی دژی ئیسلام، یانی ئاكاری(ماركسی)، (مەلا شێخ عزالدین)ی بێچارە بارەها-چەندینجار-پێم ووت"كورە مەخەڵەتێ، كورە ئەمانە دوژمنی ئیسلامن، كورە با نە تكەنە داردەست"، لەسەفەرەكەی(بابە كەندیا) دوای چەندجار قسەكردن وتی "وەلاّ حاڵی بووم فلاّن كەس ئەمانە(ماركسیەكان) موشكیلەن، بەلاّم چارەم نییەو ناتوانم دەستیان لێ هەڵگرم". بەهەرحاڵ، چونكە مەلا بەدەستیانەوە بوو میللەتیان دەخەڵەتاند، ئەمانە دوژمنی ئیسلام نین، لەكاتێكدا ئەم گروپانە ئەگەر ڕاستبكەن "ئاخر ماركسییەكان دوو جۆرن، جۆرێكیان صادق و ڕاست هەر لە زویەكەوە ماركسن و عەقیدەیان وابوو، چونكە دیانەتی كەسیفی خانەقاو شێخ و مەلاكانیان دیووە لایانداوە لەئیسلام، لەبەرئەوە پەیوەندییان كردووە بەمەكتەبی كۆمۆنیستەوە، ئەوانە ڕاستن بەهەرحاڵ، بەشێكی تریان كەهەر خودی دەزگای(ساواك) دروستیدەكردن، كەزۆربەیان لەناوگروپە ماركسیەكاندا بوون

کۆمەڵێکیش(CIA)ی ئەمریکی دروستیاندەکات*، ئەمانە گشتی تێکەڵبوون بەسەریەکداو گشتی سەری بەرز کردەوە، بەهەرحاڵ چی ئەمریکایی بێت و چی ساواکی بێت ، چی ڕوسی و چینی بێت لەکۆتایدا مارکسین و دوژمنی ئیسلامن. ئەم مەکتەبە لەگەڵ ئیسلامدا سازشی نییەو هەوڵ دەدات ئیسلام لەناو ببات، دووەم دوژمنی میللەتە، کورە( مەلا شێخ عزالدین ) تۆ دەڵێیت"هەرچی هەن ئەمانە هەر کوردن"، ئەوەڵەن لە دوولاوە کوردنین:-

یەکەم: مارکس دوژمنە، لەگەڵ نەتەوەدا سازشی نییە و زۆر خراپ دەڕوانێت بۆ میللەت، چونکە میللەت و هەرچی شتە لە نەزەریدا مەعلولەو شەرایەتی ئابوری ڕابردووە و خراپە و دەبێت لەناو بچێت. ئەمانەش وا لەگەڵیدا بووندەبێت گشتی لەناو بچێت، نەتەوایەتیش هەروەك(دین) خوێنتاڵە لە نەزەریداو هەوڵ دەدات لەناوی ببات مەخەڵەتێ ئەمانە کورد نین.

دووەم: ئاخر(مەلا شێخ عزالدین) بیری لێبکەرەوە(سابلاخ)ەکەی خۆت بێنە ببینە تایەك نەفەر کورد هەیە دوو سەد نەفەر سێ سەد نەفەر غەیرە کورد دەڕوات و قسە قسەی ئەوانە، ئەم گروپە مارکسیە بۆ کورد کارناکەن، کاریان نییە بەسەر

---

*) لێرەدا، کاك ئەحمەد زۆر زیرەکانە مامەڵەیکردووەو زۆر وردتر توانیویەتی حاڵی ئەوکاتەی ئینقلاب بخوێنێتەوەو وەك کۆمەڵناس و سیاسییەکی چاوکراوە دراسەی کۆمەڵگاکەی کردووە، دەربارەی بەکرێگرتن و دروستکردنی گروپەکانی لەلایەن (CIA)دوە بابەتێکی زۆر تایبەت و ناڕوونە بۆهەندێك کەس لەوڕوویەوە، کە چۆن (CIA)ی ئەمەریکی کاربۆ دروستکردنی گروپی مارکسی) دەکات؟!! لەکاتێکدا ئەو دوو دەستەڵاتە تاسەرئێسقان دوژمنی یەکن، ڕاستە دوژمنن، زیرەکی(موفتی زادە)ش لێردایە دەرکی ئەوەیکردووە.لە کتێبی(جەنگی هەواڵگیری نێوان دەزگای هەواڵگیری-KBG-CIA-دا، نوسەر دەڵێت"بڕی حەفتاو پێنج ملیۆن دۆلار، (لەلایەن دەزگای-CIA-دوە)تەرخانکراوە بۆ یارمەتیدانی هەندێك گروپی تر، کەخۆیان بە(شرعی)دادەنا، لەگەڵ چەند گروپێکی سیاسی". بڕوانە: سیلیا بلیدوسکا- جوناسان لوتش: جەنگی هەواڵگیری نێوان دەزگای هەواڵگیری ئەمەریکاو ڕوسیا جەنگی سارد،KBG-CIA، ل٤٠.

كوردستانەوە، بڕوانە لەشوێنەكانی تردا شوێن پێیان نییەو میللەت وریاترە، لەهەر كوێ سەر بەرز دەكەنەوە دەیەن بەتەوقی سەریاندا. دەزانن ئەمانە خائینن، بەتایبەتی(ئەمریكا)ییەكانیان زۆر ڕۆشنە كەچی خیانەتێكیان كرد لەساڵی(١٣٤٢)دا (حیزبی تودە) چۆن ئینقلابی ئێرانیان ووردكرد، خەڵك ئەمانە دەزانن و ڕێگەیان پێنادەن، بەلاّم میللەتی كورد فەقیرە، دێن لەكوردەواریدا ئەم كارانە دەكەن، چونكە چوار نەفەری وەك تۆ هەیە بەدەستیانەوە خەڵكی پێ بخەڵەتێنن، كورە وەرە لەبەر گروپێك كەلەلایەن ئەمریكاو عێراق و حوكومەتی شورەوییەوە پارەیان پێدەدرێت دژی ئینقلاب كار بكەن تۆ میللەتی كورد مەفەوتێنە، خاكی كوردەواری مەكە شوێنی ئەم خائین و كورد فرۆشانە. بەداخەوە سودی نەبوو.

وورده وورده زەمانگوزەریا خوا كردی هەر خۆیان بەدەمی خۆیان ماهییەتی خۆیان خستەدەرەوە، ئەوكاتە(حیزبی دیمكرات)یش هاودەستی دەكرد، لەگەڵ ئەماندا چەندین جار ئاگادارم دەكردنەوە،(حیزبی دیمكرات) پێشینەی باشبووە مەكەونە شوێن ئەمماركسیانەوە، وەرن باری میللەت بگرن، میللەتی كورد زوڵمی لێكراوە ئەمانە درۆدەكەن، ئاخری وورده وورده(حیزبی دیمكرات) جیا بووەوە لەوان-ماركسییەكان-، وورده وورده(حیزبی دیمكرات) ماهییەتی ئەوانی خستەدەرەوە، مەعلوم بوو (مەلا سید جلال) برای(مەلا شیخ عزالدین) چۆن لەڕێگەی بەعسەوە كاردەكات، مەعلوم بوو(كۆمەڵە) چۆن لەهەموو لایەكەوە دەڕۆن دەلەوەڕن و حقوقی نۆكەری وەردەگرن، بۆئەوەی دژی ئینقلاب كاربكەن. بەكورتی خۆیان وورده وورده ماهییەتی خۆیان خستەدەرەوە بەداخەوە، هەر لە(بابە كەندیا) ووتم" بە(مەلا شێخ عزالدین)تۆ بەلایەنی كەمەوە باری میللەتەكە بگرە، ئێستا كەمێك نێوانی(حیزبی دیمكرات) و(ئەم كۆمۆنیستگەلە) شێواوە، چونكە(حیزبی دیمكرات)

پێشینەیەکی هەیە بۆ میللەتی کورد، وەرە هیچ نەبێت تۆ پاڵبدە بەمانەوە پاڵمەدە بەوانەوە، ووتم"بۆچی ئەوەندە بەدبەختی؟! بۆچی ئەوەندە بەدشانسی؟!" چونکە کۆمەڵەو فیدابیەکان-چریکەی فیدای- دوژمنی دینن دوژمنی میللەتیشن، تۆ دەبیتە داردەستی ئەوان، هیچ نەبێ وەرە پاڵبدە بە پاڵ(حیزبی دیمکرات)ەوە، بەداخەوە لێرەشدا هەڵەیکردوو پاڵیدا بەخائینەکانەوە. بەهەرحاڵ، میللەتێك تا ئاگابێت کەسانێك شارەزا نەبن نیسبەت بەمەسەلەکان کلۆڵ و بەدبەخت دەبن و دەبنە داردەستی دوژمن دژی میللەتی خۆیان.

جالەگشت لایەکەوە ئەم گروپە خائینە، کەپوڵی (ئەمریکاو عێراق و شورەوی)یان وەردەگرت سەریان بەرزکردەوە، سەیرمکرد هەروەك ئەوەی ئێمە لێی نیگەران بووین دروست بوو، جا هاوار بۆ میللەتی کورد چیبکات بەدەست ئەم گشتە گروپە خائینەوە، چۆن نەخەڵەتێ ؟! چۆن خاکەکەی وێران نەبێت؟! چۆن خەڵکەکەی سەرلێشێواو نەبێت؟!

# كاك ئەحمەدی موفتی زادە لەبەردەم چەمكەكانی ﴿هەژاری- موستەزعەف- ملاء- موترەفین- ئەشرافییەت﴾دا

یەكێك لەو بابەتانەی لەژیانی(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) جێگەی گرنگی پێدانەو هەرگیز ناكرێت ئاماژەی بۆنەكرێت، ئەویش بریتییە لە تێڕوانینی موفتی زادە بۆ چەمكەكانی(هەژاری و موستەزعەف و لەقەب و ملاء و موترەفین)، چونكە لە تەواوی ئەو هەولانەی(كاك ئەحمەد) لەژیانی بزوتنەوەی خۆیدا داوییەتی، لەهەموو بوارەكاندا چی بواری(سیاسی، ئابوری، كۆمەلایەتی، ئایینی) هەمیشە ئەم چەمكانە ئامادەگیان هەبووە و كاری بۆكردون و كۆمەلگای كوردی بەتایبەتی و كۆمەلگای ئێرانی بەگشتی لێی ئاگادار كردونەتەوە، بۆیە لێرەدا بەدلنیاییەوە دەلێم هەرچەندە بنوسین قسە لەسەرئەم مەسەلەیە بكەین دواجار نەمانتوانیوە ئەوە بلێین، كە(كاك ئەحمەد) خۆی ویستویەتی بیلێت و كاری بۆ كردووە!

لەم باسەدا هەولدەدەین لەسەر دوو تەوەرەی گشتی قسە بكەین. لەسەرەتادا قسە لەبارەی رونكردنەوەی(موفتی زاد)ەوە دەكەین دەربارەی ئەم چەمكگەلە، دواتر هەولدەدەین ئەوە ڕونبكەینەوە، كە(كاك ئەحمەدی موفتی زادە) لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا تاچەندێك ویستویەتی لەو واقیعەدا ژیان بگوزەرێنێت، هەروەها وەلامی ئەو قسەو باسە بدەینەوە، كەدەلێت"كاك ئەحمەد، بەفیعلی كاری بۆ ئەوە كردووە ببێتە كەسێكی پلەو پایەدار و لەبەر گەیشتن بەدەسەلات هەموو كەسێكی ڕەفزكردووە.

سەرەتا پرسیارێك هەیە دەبێت هەڵوێستەیەکی لەسەربکەین و دوواتر لەرێگەی وەڵامی ئەم پرسیارەوە داغلی ئەو دونیا فراوان و ئەو هەوڵە بەردەوامەی(موفتی زادە)دەبین. پرسیارەکەش ئەوەیە، (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) ڕاهبەری ئەهلی سوننەی کورد، ئەو بزوتنەوەیەیی بەرپایکرد و خۆی بوویە پێشەنگی و شەو ڕۆژی خستە سەریەك بۆئەوەی مافی نەتەوەکەی وەربگرێتەوە دروشمەکانی چی بوون؟

کاك ئەحمەد، بە(سێ) دروشم دەستیپێکردو تا مردنیش بەم دروشمانە بەئەمەك و باوەڕدار بوو، کەبریتیی بوون لە[1]:

- **نەهێشتنی ستەمی نەتەوایەتی**
- **نەهێشتنی ستەمی مەزهەبی**
- **نەهێشتنی ستەمی چینایەتی**

ئەمانە ئەو(سێ) دروشمە بوون، کە(کاك ئەحمەد) لەهەموو وتارو نوسینەکانیدا کاری بۆ دەکردن و هەوڵی چەسپاندنی لەیاسای ئەساسی دەستوریدا دەدا، چونکە دەیزانی یەکێك لەهۆکارەکانی هەڵوەشاندنی کۆمەڵگا و لەبن هێنانی بریتییە لە(ستەم). ستەم بریتییە لەدەست درێژیکردنەسەر مافی مادی و مەعنەوی مرۆڤەکان[2].

لەئەنجامی تێڕامانی قوڵی(موفتی زادە) لەقورئان ئەوەی بۆ دەرکەوتووە لەسەر زەویدا(دوو)جۆر کۆمەڵگا هەیە.

---

[1]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە: دیوانی شعری دیاری بۆ یاران، چاپی یەکەم ، زستانی ١٣٨٦، ل- ل ل

[2])کاك ئەحمەدی موفتی زادە، و. یاسین حەمە سەعید: یەکبوونی ئیسلامی، گۆڤاری هەژان، ژ.١٧-١٨، ٢٠٠٦، ل٢٨٥.

كۆمەڵگای(دینی) و كۆمەڵگایەكی (تاغوتی)،"قورئان كۆمەڵگای دینی بەئێمە حاڵی دەكات كەبریتییە لەكۆمەڵگایەك بەبێ ئیمتیازات، بێ چینایەتی، بێ گەورەو بچوك، كۆمەڵگای بێ ئەداو ئەتوار، كۆمەڵگای بێ فیزو تەكەبور، بێ لەقەب و تایبەتمەندی.

كۆمەڵگای تاغوتی، واتە كۆمەڵگای پلە پلە، كۆمەڵگای سیلسیلە و مەراتیب،و ئیمتیازات، واتە كۆمەڵگای لەقەب و مەدالیا، كۆمەڵگای ماقوڵ و ناماقوڵ و ئەشرافی، كۆمەڵگای هەژارو دەوڵەمەند، هەموو ئەمانەش گشتی كلۆڵی و بەدبەختی خەڵكی دەیكێشن، ئەگەر قورئان شارەزابین كۆمەڵگای تاغوتی ئێستا* قوبوڵ ناكەین"[1].

دوای ئەو دابەشكاریەی بۆكۆمەڵگای دەكات لەسەرئاستی جیهان بەگشتی، دێت لەناوخودی هەركۆمەڵگایەكیش لەو(دوو) كۆمەڵگایەدا(سێ) ئاست لەژیانی خەڵكی جیادەكاتەوە، كەدیارە دووبارە سەرچاوەی مەعریفی و پەی بردنی بەو چینانەی كۆمەڵگا هەر قورئانی پیرۆزە. (كاك ئەحمەد) لەو نامانەی كەئاراستەی دەسەلأتدارانی ئەوكاتەی حوكومەتی ئینقلابی كردووە، كە(بەنی صەدر)-سەرۆك كۆمار-ی بووە، هەمیشە لەو مەترسیانە ئاگاداری كردونەتەوە و باسی ئەوەی كردووە، دەبێت ئەو تەبەقات و جیاوازییەی لەكۆمەڵگادا هەیە چارەبكرێت و لەڕیشە دەربهێنرێت، ئەگینا دەبێتە ڤایرۆسێكی كوشندەو كۆمەڵگا نەغرۆی لەناوچون دەكات. دیارە زۆربەی زۆری ئەونامەو یاداشتانە لە دووتوێی كتێبێكدا

*) مەبەستی موفتی زادە لە(كۆمەڵگای تاغوتی ئێستا) دەسەلاتی(شا)یە، چونكە كاتێك ئەم ووتارەی پێشكەش كردووە حوكمی شاە نەروخاوە ئەمەش ئاماژەیەكی دیكەیە بۆ ئازایەتی و چاونەترسی موفتی زادە و حساب نەكردنی بۆ دەسەلأتی شاهنشاهی لەوكاتەدا.

[1]) كاسێتی ژ.(٢).(١٧)، زبانی كوردی،B

چاپو بلاۆكراوەتەوە بەزمانی فارسی وبەناوی(دەربارەی كوردستان)، كە مامۆستا (مودریك عەلی عارف) لەبارەیەوە دەنوسێت: "ئەگەر جاران و بەرلە خوێندنەوەی ئەم كتێبە وا گومانم بردبێت، كەمێك ئاشنای(موفتی زادە)م ئەوا بەڕاستی ئێستەو پاش خوێندنەوەی ئەم كتێبە زۆر بەراشكاوانە دەڵێم تۆزقاڵێك لەو پیاوە شارەزانیم، بەڵكو نەك هەر شارەزانیم زۆر بێ ئاگاتر لەو كەسەم كەتەنها جارێكیش ناوی ئەم مەردە نەبەردەی نەبیستبێت، ئاخر كاتێك وشە و دێر و نامەكانی ناو ئەم كتێبە دەخوێنرێتەوە ئەوكات دەزانیت كورد كێیە؟ كوردستان چییە و كێی تێدا دەژی؟ سوننە مەزهەب بوون چی تاوانێكە و شیعە مەزهەب بوون چییەو تاج و شەرەفێكەوە؟ هەژاری و هەتیوی بێ كەسی و بێ پشتوپەنای و دوو بەرەكی و چ دەردو و ئافاتێك و شەری ناوخۆ چ خۆرەێكی تیابەرە"[1].

جگە لەو نامانەی لەو كتێبەدا هەن، لەناو نامەیەكیشدا كەبەتایبەتی بۆ(ئیمام خومەینی)نوسیوە بەهەمان شێوە باسی ئەم دابەشكارییەی كۆمەڵگای كردووە ترسناكییەكەی خستۆتەڕوو. دوای ئەوەی كۆمەڵگای مرۆی دابەش بووە بەسەر دوو جۆر لەحوكومەتدا(حوكمەتی دینی و حوكمەتی تاغوتی)، (سێ)چینی سەرەكی كەبەپێی گۆڕان و تێپەر بوونی كات و پەیامی ئاسمانی ڕیزبەندییەكی زۆر ورد و جوانی كردووە كۆمەڵگا دەكات بە(سێ) چین و توێژی سەرەكییەوە:[2]

1. **موستەكبیرین: دەسەڵاتداران**
2. **موترفین: سەرمایە داران**

---

[1]) مودریك علی عارف: ڕانانێك بۆ كتێبی (لەبارەی كوردستانەوە)ی ئەحمەدی موفتی زادە، گۆڤاری ڕاهـ ما، ژ.(٦-٧-٨)،پایزی ١٣٥٨، ل٨٤.، هەروەها هەمان بابەت لە گۆڤاری "هەژان" ژمارە (١٧و١٨)ی ساڵی (٢٠٠٦)دا بلاۆكراوەتەوە.

[2]) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩٨.

## ٣. موستەزعەفین: هەژاران و لاوازان

بونی دوو چینی(یەکەم و دووەم) دەبێتە هۆکاری دروستبوونی چینی(سێیەم)، کەهەژارانن. لەلایەکی دیکەوە قورئان باسی(سێ) جۆر دەسەلاّت دەکات، کەدەبنە هۆی بلاّوبونەوەی فەسادی و گەندەڵی و لەناوبردنی مرۆڤ، چونکە هەرکات کەسێك بەیەکێك بەو(سێ) دەسەلاّتە لەڕەعییەتەکەی-ئەو کەسەی لەژێردەستیدایە-ستەمیکرد، ئەوکاتە ئیدی ڕێگەی ئاسودەی و بەختەوەری ژیانی دونیایان لێ دەسێنرێتەوە ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ﴾ البقرة٢٠٥ئەو(سێ) دەسەلاّتەش بریتین لە:[١]

١. **دەسەلاّتی سیاسی**
٢. **دەسەلاّتی سەربازی**
٣. **دەسەلاّتی ئابوری**

کە(سێ) کەسی ستەمکاری سەردەمی حەزرەتی(موسی)-سەلامی خوای لێبێت-ئەم دەورەیان گێڕاوە:

١. فیرعەون: دەسەلاّتی سیاسی تاکڕەوی ستەمکارانە.
٢ هامان: دەسەلاّتی سەربازی پێشێلکارانە و ئازاردانی جەستەی و ژیان تالکردن.
٣. قارون: دەستەلاّتی ئابوری قۆرغکارانەو سەرمایەدارانە.

---

[١]) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

كاتێك(كاك ئەحمەدی موفتی زادە)، سەرنجی كۆمەڵگای ئێرانی بەگشتی و ناوچەو شارە كوردییەكان بەتایبەتی دەدات و ئەو(سێ) چینە ئەو(سێ) جۆرە لەدەسەڵات دەبینێت. بۆیەلای(موفتی زادە) دەرئەنجامی ئەو سێ چینە و ئەو سێ دەسەڵاتە یەكسانە بەسێ ستەم بەرامبەر بەگەل و هاوڵاتیان، ئەویش ئەوانەكە لەسەرەتاوە ئاماژەمان بۆ كرد، بریتی بوون لەو سێ دروشمەی بۆ ڕزگار كردنی كۆمەڵگای ئێرانی بەگشتی هەڵیگرت بوون (ستەمی نەتەوەیی و ستەمی چینایەتی و ستەمی مەزهەبی)، كاك ئەحمەد، زۆر باش ئەوانەی دەرك كردبوو، نەتەوەیەك لەبەر كوردبونی لەبەرئەوەی كەزمانی كوردی هەیە تاچ ئەندازەیەك ستەمی لێكراوەو لێی دەكرێت، بۆیە كاتێك ئاوڕێكی خێرا لەژیانی(موفتی زادە) دەدەیتەوە لەم بوارەدا هەوڵێكی بێ سرەوت دەبینین، قودرەتێكی لەبن نەهاتوو لەپشتی ئەو پیاوەوە دەبینیت كە بە بەردەوامی پاڵی پێوەناوە لەسەر نەتەوەكەی قسەبكات‌و هەوڵبدات لەستەمی نەتەوایەتی بی پارێزێت. لەڕاستیدا بەرز كردنەوەی ئەو (سێ)دروشمە كارێكی هەروا سادەو ئاسان نییە بە تایبەتی قسەكردن لەسەر ستەمی نەتەوەیی و ئایینی، چونكە هەركات دەستەڵاتداران ویستیان تاوانباری بكەن ڕاستەوخۆ ئەوە دەخەنە پاڵی كە(موفتی زادە) ڕیزەكانی كۆمەڵگا تێكدەدات‌و جیاوازی دروست دەكات، بۆیە دەبینین مێژووی(كاك ئەحمەد)یش لەم بوختانە خاڵی نەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو زۆر مەنتیقی ترو لەوە قوڵتر بیری كردۆتەوە، كەبەرامبەرەكانی سەیریان كردووە. ئەوە تاڵەبارەی لێكترازانی كۆمەڵگاوە لەو سەرەوە دێتەوە و دەڵێت"زۆرێك لەو بابەتانەی لەكۆمەڵگای ئێمەدا دەخرێنە ڕوو ئەم بابەتانە بوونەتە هۆی لێكترازان و پارچە پارچە بوون، لەژێر دوو وشەی ستەم و سەركوتكردندا كورت دەكرێنەوە لەجۆرەكانی ستەمیش، ستەمی

نەتەوەیی و ئایینی و چینایەتی و، دەبینی كۆمەڵگای ئێمە بەڕادەیەك لەچەمكی ئازادی دەربڕینی هزر و خواست و ئارەزووەكان دور كەوتۆتەوە، كاتێك باس لە لابردنی یەكێك لەم ستەمانە دەكرێت تەنانەت هزرمەنترین كەسانی نێو كۆمەڵگای ئێمە، تەنانەت كەسانێك، لەئاستی بەڕێوەبردنی كۆمەڵگادان تاڕادەیەك توشی شڵەژانو گوماندەبن، بۆنمونە كاتێك باس لەمافی نەتەوەیی نەتەوەكان دەكرێت باس لە (خودموختاری)-خۆبەڕێوەبردن-ی نەتەوەكان لەلایەن خۆیانەوەدەكرێت، دەبینی زۆرێك لەخاوەن ڕایان ئەم گوزارشتە دەگەیەننە سنوری پارچە پارچەكردنی وڵات، لەكاتێكدا هیچ پەیوەندیەكی عەقلانی و لۆژیكی لەنێوان خۆ بەڕێوەبردنی گەلانو جیاخوازیدا نییە، بەڵكو بەپێچەوانەی سەپاندنی بەزۆر یەككگرتنی گەلان هۆكاری پارچە پارچە بونە، نەك خودموختاری و خۆ بەڕێوەبردنی گەلان"[1] .

كارو چالاكییەكانی(كاك ئەحمەد) لەم بوارەدا دەتوانین لەهەموو ئەو كۆڕو سیمینارو نامەو نوسینانەدا بەدی بكەین، كە لەسەرەتای جولانەوەو بیركردنەوەیەوە كاری بۆ كردووە. ئەو كاتێك كاردەكات بۆ ئەوەی نەتەوەكەی لەستەم ڕزگار بكات ڕاستەوخۆ دێت لەسەر فەرهەنگی كورد كار دەكات لەڕێگەی وتارەكانییەوە دەستدەكات بەوەی خۆی ناوی دەنێت(پالاوتنی فەرهەنگ)[2]، لەڕێگەی ئەم(پالاوتن)ەوە خەڵكی لەگەورەیی و سەربەرزی مێژووی پڕسەروەری نەتەوەیی كورد ئاگادار دەكاتەوە، لەوێوە دەستپێ دەكات كە دەبێت هەر تاكێكی كورد بەزمان و لەهجەی كوردی قسەبكات و كەس نەبێت لەجیاتی زمانی كوردی لەكاتە

[1]) كاك ئەحمەدی موفتی زادە، و. یاسین حەمە سەعید: یەكبوونی ئیسلامی، گۆڤاری هەژان، ژ.١٧-١٨، ٢٠٠٦، ل٢٩١.

[2]) كاسێتی ژمارە(٧)،درباره انقلاب فرهنگی،(٦٦)A

ئاساییەکاندا بەهیچ زمانێکی دیکە قسە بکات، بۆیە دەبینین لەبارەی زمانی کوردییەوە وتارێك پێشکەش دەکات لەم کاتو سەردەمەی ئێمەدا پێویستە هەموومان بەوردی و بەقوڵی بیخوێنینەوە*.

ڕاچڵەکاندنی نەتەوەیی کورد، بۆئەوەی شانازی بەبونی خۆیەوە بکات لەوێوە دەستپێ دەکات، کە هەڵدەستێت(پانتۆڵ) لادەبات و لەبری ئەوە(شەڕواڵی کوردی) لەبەردەکات و بەجلی کوردی ڕەسەنەوە دەستدەکات بەگەڕان بەناو شەقامەکانی سنەدا، کەخۆی دەیگێڕێتەوە چۆن تانەیان لێداوە و بەچاوی ڕەخنەوە تەماشایان کردووە. بۆ بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی لەو خاڵەوە دەستپێدەکات، کەکوڕە منداڵە تاقانەکەی هەر لەسەرەتای خوێندنییەوە فێری ئەوەی دەکات لەبەر کوردبونی ڕوبەڕوی هەرستەمێك بێتەوە دەرهەقی ئەنجامی دەدرێت و بەوە ئامۆژگاری دەکات، جلی کوردی لەبەرکردن لەقوتابخانەدا بەنیسبەت منداڵ بوونی ئەوەوە جۆرێکە لە(جیهاد-تێکۆشان). (کاك ئەحمەد)، بەتەواوەتی ئەوەی بۆ ڕوون بۆتەوە، بۆئەوەی میللەتێك ستەمی بەرامبەرنەکرێت، سەرەتا پێویستە لەناوخۆیدا بڕوای بەخۆی هەبێت، خۆی بسەلمێنێت، فەرهەنگ و کەلتوری خۆی لەهەر دەستتێوەردانێکی دەرەکی پاك بکاتەوە و ئەوکاتە کارکردن و وەستان لەبەرامبەر تاغوت و زۆردارەوە کارێکی قورس نابێت، چونکە(کاك ئەحمەد) هەمیشە وتویەتی"میلەتێك مافی ژیانی هەیە، کەمەسئولیەت و وەزیفەی خۆی بناسێ،و لەوەزیفەی خۆی لانەدات، سادەترین وەزیفەی ئینسانی، ئەوەیە لەسەر حەقی خۆی بێتە جواب و دیفاع لە حەقی خۆی بکات"[1]. ترسی ستەمی نەتەوەیی، ترسێك بوو

*) لەبەشی(پاشکۆ)دا وتارەکە بلاۆکراوەتەوە.

[1]) کاسێتی ژمارە(٦)، سخنرانی بۆکان، (٤٥)A

هەمیشە لەگەڵیدا ژیاوە و کاری بۆ چارەسەرکردنی کردووە، بۆیە بەردەوام هۆشیاری دەداتە حوکمەت و سەرانی ڕژێمی ئەوکاتەی ئێران، نامەی تایبەت ئاراستەی(د.بەنی صەدر) دەکات و لەم(سێ) ستەمە ئاگاداری دەکاتەوە و داوای چارەسەری بەپەلەی لێدەکات. لەنامەیەکدا کەلەچەند مادە و خاڵ پێکهاتووە باس لەڕێگە چارەکانی حوکمەتی ئێران دەکات و لەخاڵی یەکەم دا دەڵێت"(قانونی ئەساسی)-دەستور- دەبێت چاکسازی تێدابکرێت لەبارەی هەرسێ ستەمی نەتەوەیی و مەزهەبی و چینایەتی یەوە"[1]، هەروەها لەنامەیەکی دیکەدا بۆ(ئەنجومەنی شۆرشی ئیسلامی ئێران)—پەرلەمان— داخوازی خۆی و گەلەکەی ڕوندەکاتەوەو بەکورتی لەسێ خاڵدا ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت[2] :-

١. یەکسانی لەمافی نەتەوەیی و ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی هەموو گەلانی ئێران.
٢. یەکسانی لایەنی سیاسی و یاسایی پەیڕەوانی هەر دوو مەزهەبی سوننەو شیعە.
٣. یەکسانی لەمافە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی هەموو تاك و هاوڵاتییەکان.

بەم جۆرە زۆر بەکورتی بۆمان دەردەکەوێت (موفتی زادە) لەبارەی نەهێشتنی ئەم ستەمەوە چ جۆرە هەوڵێکی داوە.

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: تلگرافی ئەحمەدی موفی زادە بە ئیمام خومەینی، عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

[2]) سەرچاوەی پێشوو.

## ستەمی مەزهەبی:

کاك ئەحمەدی موفتی زادە، بەهەمان ئەو شێوەیەی هەوڵیداوە بۆ نەهێشتنی (ستەمی نەتەوەیی) بەو جۆرەش هەوڵیداوە بۆ نەهێشتنی ئەو ستەمەی بەناوی ئایینەوە لەمەزهەبی سوننە دەکرێت. هەربۆیە دەبینیت لەسەرەتای ئینقلابدا هەموو هەوڵی خۆی دەخاتەکار، بۆئەوەی ئەوستەمە مەزهەبیە نەمێنێت‌و سەرهەڵنەداتەوە، چونکە ئەو وای دەبینی دەستەڵاتی شاهنشاهی تاغوت سودێکی زۆری لەم بابەتە بینیوە و هەمیشە لەڕێگەی بەگژدادانی مەزهەبەکانەوە هەوڵی تێکدانی ڕیزەکانی کۆمەڵگای داوە، ئەو لەو وتارەیدا، کە لەسەرەتای سەرکەوتنی ئینقلابەوە لەڕۆژی(١٣٥٨/٢/١٨) لە کۆلیژی گواستنەوەو گەیاندنی تاران*، پێشکەشی دەکات زۆر بەڕون و ئاشکرایی باسی ئەوە دەکات، دەبێت هەموو هەوڵێکمان بخەینەکار کێشەیەك بەناوی کێشەی مەزهەبییەوە دروست نەبێت.

لەپرسیارێکدا ئاڕاستەی دەکەن، لێی دەپرسن ئیسلام شیعەیە یان سوننە؟

لەوەلآمدا دەڵێت"زۆرسادە پێتانبڵێم، ئیسلام واتە قەدی درەختەکەو شیعەو سوننە لقەکانی ئەم درەختەن"[١]، هەروەها لەدرێژەی قسەو باسەکانیدا، زۆر بە ڕونی باسی ئەوە دەکات، چۆن کۆمەڵگای ئیسلامی لەخەتی سەرەکی لایداوەو لەباتی پەیڕەوی لەئایین بکات هاتووە کار لەسەر ئایینزا دەکات. ئەو دەڵێت"ئایین و ئایینزا لە یەکتری جیاوازن. ئایین بریتییە لەبنەڕەت و ئایینزا بریتییە لەلقەکان. ئێمەش

---

*) لە کتێبی (٢)دا تەواوی وتارەکە بڵاوکراوەتەوە.

[١]) کاك ئەحمەدی موفتی زادە، و. یاسین حەمە سەعید: یەکبوونی ئیسلامی، گۆڤاری هەژان، ژ.١٧-١٨، ٢٠٠٦، ل٢٩٨

لەبەرئەوە لە بنەڕەت دور كەوتوینەتەوە دەستمان بەلقە كانەوە گرتووە، لەئێستادا ئێمە ئایینزایین نەك ئایینی، دەبێت هەوڵبدەین ببینە ئایینی، نەك ئایینزایی، و ڕێگەكەشی تەنها ئەوەیە چەند كۆبونەوەیەك لە تاران بەناوی(شورا)وە هەبێت، كە لەناو ئەو كۆبونەوەیەدا دانە بە دانەی كێشەو بابەتەكان لەوانە لەدەستوری ولاّتدا جێگای بایەخ پێدانن و ئەوانەش بابەتە لاوەكییەكانی نێو كۆمەڵگا دەگرێتەوە لە بارەیانەوە باس و لێكۆڵینەوە بكرێت، پاشان ئەو ڕێگایەی لەگەڵ پێوەرە بنەڕەتییەكاندا دەگونجێت و هەڵبژێرێت و كۆمەڵگاشی لێ ئاگادار بكرێتەوە، بەپێچەوانەی ئەمیشەوە شتێكی ڕوونە، كەهەرگیز ناتوانین لەم لێكترازانە بەرەو یەكبون هەنگاو بنێین"[1].

كاك ئەحمەد، زۆر مەبەستی بوو ئەو كەلێن و درزانە پڕبكاتەوە و چارەیان بكات، كەزەمەنێكە دوچاری ئایینی ئیسلام بۆتەوە، وەك وتمان ئەو هەمیشە هەوڵی داوە ئەم بابەتە ئاڵۆزە سادە بكاتەوە و لەدەستی ئەو نەزان و تێكدەرانە دەری بهێنێت و بیداتەوە دەستی زاناكانی هەردوو مەزهەبوو هەوڵبدرێت لەڕێگەی زاناكانەوە چارەبكرێت، جگە لەوەش ئەو پەیامە بداتە گوێی خەڵكیدا، كەبابەتی مەزهەبی(شیعەو سوننە) بابەتێك نییە هەرنەزانێ هەستێ و قسەی تێدابكات، بۆیە دەبینیت لەووتاری(كۆلێژەكەی تاران) ئەوە ڕوندەكاتەوە، ئەم دوو لقە گەورەی ئایینزا(شیعە و سوننە) چەند جیاوازی یەك لە نێوانیاندا هەیە، ئەم جیاوازیانە سروشتین و خاوەن ڕایان بونەتە هۆی دروست بوونی، بەلاّم بەداخەوە چەند جۆرێكی تر لە جیاوازی هەیە، كە لەلایەن خودی مرۆڤەوە بەسەر ئایینزادەكان و پەیرە و كارانی ئایینزادەكاندا سەپێنراوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشو. ل٢٩٨

كاك ئەحمەد، پێیوایە كاتێك چەند تایبەتمەندییەك لەسەردەمی(سەفەویەكان) بەدواوە،و تەنانەت چەند سەدەیەك پێش لەوانیش خراوەتە سەر ئایینزای(شیعە) دەخەینە لاوە و كاری پێناكەین، بەهەمان شێوە چەند تایبەت مەندیەك لەئایینزای(سوننی) دەخەینە لاوە ئەوكات دەبینین ئەم دوو ئایینزایە لەبنەڕەتدا بەیەك دەگەنەوە"[1].

موفتی زادە، دوای ئەوەی نەخۆشییەكانی كۆمەڵگای دیاریكرد و ئەو هەموو كۆشش و قسە جدییەی بۆ چارەسەركردن و لاواز كردنیانكرد، بەڵام وردە ئەگەرەكان بۆ سەرهەڵدانی(ستەمی مەزهەبی) بەهێز دەبێت، لەگەڵ ئەوەی هەمیشە خودی ڕەهبەری مەزهەبی شیعەو رابەری شۆرشی ئێران(ئیمام خومەینی) بەڵێنی پێدەدات و لە هەموو جێگەو لەوەڵامی هەموو نامەكاندا ئەوەی بۆ دووپات دەكاتەوە، شتێك ڕونادات بەناوی سستەمی مەزهەبییەوە. تەنانەت(ئیمام) خۆی نەعلەتی كردووە لەو كەسانەی جیاوازی دروستدەكەن لەنێوان مەزهەبەكاندا، ئەوەتا(كاك ئەحمەد) لەچاوپێكەوتنی لەگەڵ ڕۆژنامەی(كیهان) ئاماژە بەوە دەكاتو دەڵێت"خەڵكمان هۆشیار كردۆتەوە لەحوكمەتی ئیسلامیدا جیاوازی چینایەتی هیچ مانایەكی نییە، ئێستاش كاری ئێمە هەر ئەوەیە بۆچونەكانی مەكتەبی ئیسلامی بەتەواوەتی پیادە بكەین، بەڵام بەداخەوە ڕێڕەوی كارەكان بەجۆرێكن نەك هەر لەڕوی ئیشەكەوە، بەڵكو لەڕوی شێوەی ئیشكردنیشەوە بەجۆرێكە خەڵك بەرەو نائومێدی دەبات، مەگەر خەڵكی جارەهای جار نەیانبیستووە لە(ییمام) ئەو كەسانێكی بەنەعلەت كردووە كە لەنێوان مەزهەبەكاندا جیاوازی دروستدەكەن، دەیباشە ئێوە چۆن(ئەسڵی١٢-دوانزە ئیمامەكانی شیعە-) كەبووەتە هۆی جیاوازی

[1]) سەرچاوەی،ل٢٨٨.

دروستکردن لەنێوان(شیعە و سوننە)دا، بۆ خەڵکی باسبکەین؟! کاردانەوەی خەڵکی چۆن دەبێت جگە لەنائومێدی؟! تـائیرە قسەکانمان لەگەڵ کارەکانماندا پێچەوانە دەبنەوە و هاورێك نین، من تائەوەی بتوانم کۆمەڵ ئاراستە دەکەم ئێستا کارەکان تۆزێك ئیسلامی نین، بەلاّم هەردەبێت هەوڵ بدرێت تاکەم و کورپەکان لابرێت"[1].

هەروەها لەیەکێك لەو نامانە(ئیمام )بۆ"ڕۆحانییەکی" ناوچەی(کرماشان) بەناوی (ایت الله عبدالجلیل جلیلی) دەنوسێت"لەبەرێزتان و هەموو زانایانی(کرماشان) چاوەڕێ دەکەم یەك ریزی بپارێزن و لەم هەستانەوە پیرۆزەدا بەشداری بکەن، ئەگەر خوا نەخواستە لەمەدا شکست بهێنین، میللەتی موسوڵمانمان بۆ هەمیشەیی لەژێر زوڵم و ستەم و ڕەنجو عەزابدا دەبێت...."[2]، هەروەها لەنامەیەکی دیکەدا، کەلەبەرواری(٢٤/١٠/١٣٥٧)لەرۆژنامەی(کیهان)ی(٢٦/١٠/١٣٥٧)بلاّوکراوەتەو، بەهەمان شێوە نامەیەك ئاراستەی هەموو خەڵکی کوردستان دەکات، و تێیدا داوای پاراستنی یەکریزی دەکات. لە بەشێکدا ئاماژە بەوە دەکات، تەنها رێگای نەمانی چینایەتی تەتبیقی ئایینی ئیسلامە،"بەدڵنیاییەوە بزانن چارەسەری هەموو ئەو چینایەتییەی لە حوکمەتی ئیسلامیدا هەیە و وەکو حوکومەتی تاغوتی نییە، کە لەئەودا هەموو ڕێگا لەهەستیدا-واتە، تەنها لەرێگەی پشت بەستن بە هەستەکانی مرۆڤ و یاسا دانراوەکانەوە کۆمەڵگا ڕێکدەخرێت، بەلاّم لە

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤

[2]) بهرام ولدبیگی: تاریخ سیاسی اجتماعی پاوه و اورامانات در بیست سال اخیر-١٣٦٨-١٣٤٨هـ.ش. چاپ،اول.زستان ١٣٩٦، چاپخانه پەیام. نشر احسان، تهران.لا١٠١

ئیسلامدا لەگەڵ پشتبەستن بە هەستەکانی مرۆڤ، لەهەمانکاتدا پشت بەگەورەترین سەرچاوەی زانیاری دەبەسترێت، کەبریتییە لە(وەحی)-کورت دەبویەوە"[1].

بەڵێنەکانی سەرانی ئینقیلاب تەنها لە(خومەینی)دا کورت نابێتەوە، بەڵکو هەموویان ئەو بەڵێنانەیان داوە، بەڵام بەداخەوە دواجار چاوپۆشییان لێدەکەن و لەکاتی دانانی(دەستور)دا(لەمادەی ۱۳)دا دەنوسن مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەت (شیعەی جعفەری)ە، بەبێ هیچ ئاماژەکردنێك بۆ ئایینی ئیسلام کەلەم بابەتەدا ئەساسە، بۆیە(کاك ئەحمەد) بەمە زۆر بێتاقەت دەبێت و بۆچەندین بارە دەستدەکات بەهەوڵ و کۆشش بۆ ئاگادار کردنەوەی ئەوانەی لەدانانی ئەو دەستورەدا بەشداریان کردووە، جگە لەوەی وەك ئاماژەمان بۆ کرد، پێش ڕودانی هەر شتێك ئەو هەمیشە دەست پێشخەری کردووە و ڕێگە چارەکانی ئاراستە کردووە، ئەوەتا لەچاو پێکەوتنێکدا، لەگەڵ ڕۆژنامەی(اطلاعات)دا سەبارەت بە دەستوری بنەڕەتی و (ڕفراندۆم) پرسیاری لێدەکرێت و ئەویش ڕاشکاوانە راو بۆچونی خۆی و ئەهلی سوننە دەخاتە ڕوو:

☒ ڕای ئێوە لەبارەی دەستوری بنەڕەتییەی(ڕفراندۆمەوە) چییە؟ ئەگەر لەحاڵێکدا پەسەند بکرێت.

+سەبارەت بەدەستوری بنەڕەتی وڵات، دەبێ ڕەچاوی(دوو) خاڵ بکەین، یەکەمیان/ ناوەڕۆکی ئەو دەستورە.

دووەمیان/ چۆنییەتی ڕێك خستنی ئەو دەستورە، چی لەڕوی زانستییەوە، چی لەڕوی هونەری و داڕشتنەوە.

---

[1]) هەمان سەرچاوە،ل۹٦.

ریفراندۆمیش واتاو رۆحێکی گشتی هەیە، ئەو دەرئەنجامەی هەیەتی بەهەمان شێوەیە هەروەك چۆن پێشتر لەبارەی پەسەندکردن، یان رەتکردنەوەی(کۆماری ئیسلامی) و دانانی لەجێی(سیستەمی پاشایەتی) ریفراندۆم پەیرەوکرا، ئەوە کارێکی باش بوو ئەنجامدرا لەو کاتەدا خەڵك بەگشتی تەنها کەمێك زانیاری شوناسێکی کەمیان بەسبوو، بۆئەوەی هەڵبژاردن دروست بکەین، بەلاّم لەدانانی دەستوری بنەرەتی ولاّتدا سەرەرای گشتگیربونی بابەتەکە مەسەلەی ویستو ئارەزوی خەڵك لەئارادایە، زۆر بابەتی زانستی و هونەری وردە هەیە خەڵك بەگشتی نایزانن و دەستیان پێی ناگات. بۆیە رۆڵی(ریفراندۆم) لەدانانی دەستوردا تەنها پەسەندکردنی(ناوەرۆك و رۆحی ) ئەو دەستورەیە لەلایەن خەڵکەوە بەگشتی، نەك دانانی ئەو دەستورە و ناوەرۆکەکەی، لەبارەی دارشتنی ناوەرۆکی دەستورەکەوە دەبێت بگەرێینەوە بۆلای شارەزایان و پسپۆرانی ئەوبوارە، لێرەدایە ئێمە جەختدەکەینەوە لەسەر ئەوەی زانایانی ئەهلی(سوننە) دەبێ بەشداریان پێ بکرێت لە دانانی دەستوردا، زۆرجار دووبارەمان کردۆتەوە(ئەهلی سوننە) دەستوری بنەرەتی ولاّت رەتدەکاتەوە، ئەگەر زاناکانیان بەشدار نە بووبن لەدانانی ئەو دەستورەدا"[1]، وادەزانم لێرەدا زۆر رون دیارە(کاك ئەحمەد) چۆن ویستویەتی شارەزایانە و لەرێگەی(ریفراندۆم) و بەژداریکردنی زانایانی سوننە لەدانانی دەستوردا رێگە لەو کارەساتە بگرێت کە رویدا!

---

[1]) بەهزادی خۆشحاڵی: عەلامە ئەحمەدی موفتی زادەو کوردستان، روزهای بحران ٤.

## ستەمی چینایەتی (طبقاتی):

قسەکردنی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە) لەبارەی جیاوازی چینایەتی و ئەو تەبەقاتەی لەناو کۆمەڵگادایە بەئەندازەیەکە، ئەگەر کەسێك پێشینەیەکی لەسەر(کاك ئەحمەد) نەبێت ڕاستەوخۆ لە کۆڕو سیمینارە کانییەوە دەستپێبکات بەو ئەنجامەدەگات، ئەم پیاوە تەنها کارێك کەویستویەتی لەکۆمەڵگادا ئەنجامی بدات بریتییە لە نەهێشتنی ئەو بەرز و نزمییەی کۆمەڵگەی داپۆشیوەو کۆمەڵێکی کردۆتە کۆیلەی کۆمەڵێکی دیکە، چونکە دەبێت ئەوەمان لەیادبێت (موفتی زادە) پێش ئەم ستەمە(ستەمی چینایەتی)، تـا ئەو شوێنەی توانیویەتی کاری بۆ نەهێشتنی دوو ستەمی کۆمەڵگا خەفەکەر کردووە(ستەمی نەتەوایەتی- ستەمی مەزهەبی)، بەڵام قسەو باسەکانی(کاك ئەحمەد) لەبارەی چینایەتی لەکۆمەڵگادا زیاترە، ئەمەش لەبەرئەوەیە ئەم ستەمە تایبەت نییە بە کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، بەڵکو ستەمێکی جیهانییەو لەهەموو کۆمەڵگایەکدا، ئەگەر زانایانە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت لە ماوەیەکی زۆرکەمدا سەرهەڵدەدات، واتە نەخۆشییەکە پێویستە بەردەوام ئاگاداری بیت و دەرمانی بکەیت. دەکرێت لەکۆمەڵگادا(ستەمی نەتەوایەتی) نەکرێت، لەبەرئەوەی ئەو کۆمەڵگایە لەیەك(نەتەوە) پێکهاتووە، یان (ستەمی مەزهەبی) نەکرێت، لەبەرئەوەی کۆمەڵگایەکی بێ دینە، یان یەك(دین) تێیدا حاکمە، بەڵام(ستەمی چینایەتی) دەکرێت لەهەموو شوێنێکدا بکرێت، تەنها ئەگەر ئەو شوێنە مرۆڤی تێدابێت، هەر لەبەرئەمەیە دەبینیت بە بەردەوامی(کاك ئەحمەد) باسی دەکاتو بەهەموو توانای خۆیەوە کار بۆ ئەوە دەکات لەڕیشکەوە دەرمانی ئەم دەردە

سامناکە بکات. لێرەدا بەدڵنیاییەوە دەتوانین ئەوە بڵێین، ئەگەر کەسێك بیبەوێت لەبارەی نەهێشتنی چینایەتی و جیاوازییەکانی ناو کۆمەڵگا، چ لەڕوی مادییەوە، چ لەڕوی مەعنەوییەوە قسەبکات، بەبێ گەڕانە وە بۆ (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) زۆر شت هەیە ناتوانێت ئاماژەی بۆ بکات و زۆر زانیاری هەیە لەکیسی دەچێت.

کاك ئەحمەد، لەکاتی قسەکردنی لەسەر دروست بوونی چینایەتی لەکۆمەڵگادا ڕاستەوخۆ دێت لەپەنجەرەی باڵە خانەی(قورئان)ەوە بەشارەزایی خۆی تەماشای کۆمەڵگاکانی ڕابردوو دەکات، دواتر دێت ئەوەی بینیویەتی لەڕێگەی وتارو کۆڕو سیمینارە مەستکەرو خامە بەبڕشتەکەیەوە بۆ تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە...

ئەو زۆر ڕاشکاوانە ئەوە دەڵێت، بەدرێژایی مێژوو ئەو هەموو شۆڕشەی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت) لەکۆمەڵگاکانی خۆیاندا بەرپایان کردووە، هەر لەبەر ئەمەبووە ئەو چینایەتیە و ئەشرافییە نەهێڵن، کەباڵی کێشاوە بەسەر چینی فەقیرو هەژاردا."ئەوە وا ئێمە لەقورئاندا دەبینین لەبارەی حەرەکەتی مێژووی بەشەریەتەوە، لەبارەی ئینقلابگەلی دینییەوە سەیر دەکەین، کۆمەڵێك لەمەدا خۆشگوزەران و خەڵکیان چەوساندۆتەوە، ئەم کۆمەڵە ئەشرافیو خۆشگوزەرانانە لە مێژووی ئیسلامدا بەدوژمنی خەڵك و بەناوی دوژمنی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت)و موستکبیرین و موترەفین، یان ناوە گشتییەکەیان(ملاء) دەناسرێن،ئەمانە بەدرێژایی مێژوو کارێکیانکردووە لەڕێگەی جۆراو جۆرەوە بەفروفێڵی جیاواز وردە وردە دەسکەوتی ڕەنج و کۆششی خەڵکی

بێتە ژێر دەستیان، خەڵکی بێزاربێت و ناڕەحەت زیندەگی بکات، بەڵام ئەوان خۆشبگوزەرێنن"[1].

کاك ئەحمەد، دەڵێت کۆمەڵێك وشە هەیە، هەرگیز ناتوانێت مانای پڕاو پڕی(مستعضفين)بدات، وەك وشەی(ڕەنجدەر و پرۆلیتار)، بەڕای ئەو تەنها ئەو چەمکە قورئانییە دەتوانێت ئاماژە بکات بەدەردو و ئازارەکانی(مستعضفين)، ئەمانە زەعیفکراون لە ڕوی مادی و مەعنەوییەوە، لەهەموو لایەنێکەوە زەعیفکراون، لەلایەنی فیکری و ڕۆحییەوە، لەلایەنی دەرك و شعورەوە. ئەو عیبارەتە ڕاستە(مستعضفين)، تەعبیرەکانی دیکە ناتوانن بەتەواوەتی مانای ئەم چەمکگەلە بگەیەنن. ئەم شەڕە بەدرێژایی مێژووی بەشەری بوونی هەبووە، پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت) لەسەردەمێکدا هاتوون بۆ ڕزگار کردنی وەزعی کۆمەڵگا، و ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەماعەتی(مترفين)دا ڕوبەڕوبونەتەوە، چونکە ئەگەر قەراربێت نبوەتی پێغەمبەران(سلاوی خوایان لەسەربێت) سەربگرێت یەقینەن بازاڕی ئەوان-مترفين-تەخت دەبێت، خەڵك وریا دەبێتەوە، کەخەڵکیش وریا بویەوە ئیتر ئەو نازو و غرورەی ئەوان کار ناکات، ئەم حاڵەتە بەدرێژای مێژوو بەردەوام بووە جەماعەتی(ملاء و مترفين) بوون و لەدووای ئەوان پێغەمبەران ڕوبەڕویان بونەتەوە و سەرکەوتون و ئەوان-ملاء و مترفين- شکستیان هێناوە، دووبارە هەوڵیانداوەتەوە و سەریان بەرز کردۆتەوە بۆئەوەی بتوانن خۆیان بسەلمێن، بۆئەمەش ئەو بەرنامەیەی پێغەمبەرێك هێناویەتی لەناوی بەرن جۆرەها هەوڵیانداوە، تازەمانێکیش توانیویانە زۆرترین پەیامییان لەناوبردووە. بەرنامەی ئیلاهیان فەوتاندوە، بەڵام وردە وردە هۆشیاری خەڵکی پەیدابووە، ئیتر

[1]) کاسێتی ژمارە(٧)،درباره انقلاب فرهنگی،(٦٦)B

نەیانتوانیوە بەتەواوەتی لەناویبەرن، چونكە لەچوارچێوەی(دەربار)-كۆشكی كڵێسا و خانەدان و ئەشرافییەكان-دا مایەوە و بەو شێوەیە پەیامەكەیان لەدەستی خەڵكی و(پێشەوایانی دینی) دەرهێنایە دەرەوە، وەك(تەورات و ئینجیل )، ئەسڵی(تەورات و ئنجیل)یش بەشێوەیەكی گشتی لەناو نەچووە، چونكە میللەت ئەوەندە هۆشیار بووە كەبڵێت چی لێهات؟ بەڵام چونكە لەدەست(دەربارو ڕۆحانییەكان)دابووە، هاتوون بەئارەزووی خۆیان دەستكاریان كرووە و عیبارەتیان گۆڕیوە"[1].

دەبینین بەو جۆرە(كاك ئەحمەد) دێت سەرهەڵدان و زەرورەتی بوونی دینەكان پەیوەست دەكاتەوە بە بوونی ئەو تەبەقاتییەی لەناو كۆمەڵگادا هەیە."ئینقلابی ئیسلام، وەك باقی ئینقلابەكانی تری دینی دژی ئەشرافییەت بوو، هەوڵدەدا بۆ سڕینەوەی ئەو ئەشرافیەتەی لەكۆمەڵگادا هەبوون، شوكر بۆ خوا ئینقلابی حەزرەتی(ڕەسول الله)(ﷺ) زۆر كار كرا لەوەودواش لەسەردەمی(خولەفای ڕاشدین)دا كەم تا زۆر ڕوداو ڕویدا، بەڵام بەداخەوە غەفڵەتگەری ئەشرافی سەریانهەڵدایەوە وردەوردە هاتنەوە ناوكۆمەڵگا، یەكێك لەسیفاتی ئەشرافی كەئیسلام نەفرینی دەكات ئەوەیە، باڵەخانەكان مجلل(بەشان و شكۆ-ڕازاوە) تربێت لەژیانی وەسەتی كۆمەڵگا، زیاتر بێت لەحەدی وەسەتی ژیانی خەڵكی ناوكۆمەڵگا، خەڵكی بێن باڵەخانەكانیان لەو ئەشرافی ترو و موجلەل تر دروست بكەن كەجۆرێك بێت حەدی وەسەتی ژیانی خەڵكی تێپەڕێنێت. ئەمە لەدیدی فیكرو تەمەدوونی ئیسلامییەوە شتێكە نەنگین و خوێن تاڵە لەناو كۆمەڵگادا"[2].

---

[1]) كاسێتی ژمارو(٦)، حوكمەتی ئیسلامی، (٥٨)، A

[2]) كاسێتی ژمارە(٧)، درباره انقلاب فرهنگی، (٦٦)B

موفتی زادە، دوای ئەوەی دەیسەلمێنێت کۆمەڵگای دینی، واتە کۆمەڵگای بێتەبەقات و بێ ئیمتیازات. دێت قسە لەسەر ئەوە دەکات، هۆکاری چییە زۆربەی زۆری ئەوناوچانەی سوپای ئیسلام فەتحی کردوون بەبێ جەنگ و کوشتار هاتونەتە ژێر رەحمەتی ئیسلامەوە و بەدەسەڵاتی ئیسلام ڕازی بوون؟

ئەو بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە جارێکی دیکە لەڕوانگەی نەبوونی چینایەتیو جیاوازی لەناو سوپای ئیسلام و ڕیزەکانی ئیسلامدا بەڵگەدێنێتەوە لەو گۆشەیەوە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە.

"لەناو سوپای موسوڵماندا هیچ جۆرە جیاوازییەکی تەبەقات و ئیمتیازاتێك نەبووە، ئەوەی سەرکردەی سوپایەك بۆ تێربوون خواردوێتی سەربازێکی سادەی ناو سوپاش هەرئەوەی خواردووە، کاتێك خەڵکی لەناوچەیەك ویستویانە ڕوبەڕوو ببنەوە، بەڵام دواتر ئەوەیان بینیووە و لەملاشەوە جیاوازی ئیمتیازاتی ناو سوپاکەی خۆیان دەبینی لەهەموو ڕویەکەوە، ئیتر شەڕیان نەکردوەو مسوڵمان بوون. بۆنمونە ئەوسوپایەی ئامادەکراوە بۆ فەتحی ناوچەکانی(فارس) لەژێر دەسەڵاتی تاغوتی، کاتێك خەڵکی چینی خوارەوە بینییان لەناو سوپای ئیسلامدا تەبەقات و ئیمتیازات و جیاوازی لەناو سەربازەکاندانییە و لەهەمان کاتدا سەربازانی سوپا لەدەستەی هەڵبژێراون،-ئەمەش بۆئەوەی(دین) بەسەلامەت بگەیەننە هەموو لایەك، هەروەها تەماشایانکرد ئەوکەسانەی لەسوپادانو بەشداری فەتحکردنی ناوچەکان دەکەن هەمیشە جیاوازی و ئیمتیازاتێکیان هەیە بەنیسبەت ئەوانەی نایەنە ناوسوپا، لەولاشەوە کەسەیری سوپای خۆیانکرد هەمووی چینی هەژارە بەکوشتیان دەدەن بۆ ئەوەی چینی دەسەڵاتدارن بەسەلامەت بمێنەوەو نەڕوخێن، خوێنی هەزاران جەنگاوەر دەرژێنن بۆئەوەی یەك قەترە لەخوێنی ئەوان

نەڕژێت، کەوایان خستبویە مێشکی خەڵکی فەقیرو هەژارەوە ئەو خوێنە موقەدەس-پیرۆز-ەو نابێت لەناو بچێت و بفەوتێت. ئائەمانە کاتێك لەشکری ئیسلام دەبینن دێت هەر لەدورەوە بەبێ ئەوەی تەبلیغ-بانگرێن بۆناو ئایینی ئیسلام-بکرێن، بەبێ ئەوەی دەنگی حەق بەشێوەیەکی سەریح و ئاشکرا بلاّو بێتەوە، بەبێ ئەوەی سیستەمی ناوکۆمەڵگابیینن-کۆمەڵگای ئیسلامی-، تەنها سوپای ئیسلام دەبینن، هەر بەچاوکەوتنیان بەسوپای ئیسلام دووچاری ڕامان دەبن، بیردەکەنەوە و دەڵێن سەیرکەن سوپای ئیسلامی چۆنە؟! نە چادرەکانیان جیاوازە، نە جلەکانیان، نە ئەو خۆراکەی لەمبەر بۆئەو بەر دەیگێڕن-مەبەست لە سەرکردەی سوپاوە بۆ سەربازە ئاساییەکان-، هەر لەدورەوە ئەوە دەبینن و سەیری حاڵو وەزعی لای خۆشیاندەکەن جگە لەوەی دەیانزانی جیاوازی زوڵم چەند زۆرە لەناو سوپای خۆیاندا، لەکاتێکدا سوپا لەحاڵی ئاوادا چەند پێویستی بەسەرباز هەیە بیانپارێزێت کەچی سوپا بەو حاڵەشەوە هەرگوێیان پێنادات، لەبەرئەوەیە دەبینیت سەرچاوەیەك نییە پیشانی بدات بەموتلەقی ئەسڵەن میللەتی ئێران ڕوبەڕوو بوونەوەیەکی هەبوبێت، تەنانەت لەو سەرچاوانەشدا نییە کە(١٢٠٠)ساڵ پێش ئێستە نوسراون"[1].

قوڵ ڕۆشتنی(موفتی زادە) لەدیاریکردن و دەرمانکردنی دەردە کۆمەڵایەتییەکانی ناوکۆمەڵگا، توانیویەتی سیفەتی فەیلەسوفی کۆمەڵایەتی پێ ببەخشرێت، هەرکات بییەوێت ڕەخنە لەڕەوتی ئەشرافی کۆمەڵگا بگرێت و لەبارەی ئەو تەبەقاتەوە قسەبکات، شتێك لەبەردەمی خۆیدا نابینێتەوە ببێتەمایەی ڕێگری، ئەم قسەیەش لەدواتردا باشتر ڕون دەبێتەوە. بەلاّم تائێستا وەك خۆی

[1]) کاسێتی ژمارە(٢).درمورد چگونەگی حملە اعراب بە ایران.(١٩).A

